# سروود

## 10-11

گۆڤارێکی گشتی سەربەخۆی وەرزییە

مجلة عامة مستقلة فصلية

ساڵی سێ یەم - 2004

السنة الثالثة - 2004

یەکەی سوتاوی گەورە ساڵان

بە زووخاڵ بوونی کەژاوەیەک لە گوڵە ڕووپاکەکانی کوردستان بۆ ؟

جۆنیەتی سەرهەڵدانی ڕێبازی تەصەوف لە کوردستاندا


پروفیسۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵ


دکتۆر عوسمان عەبدول بەرزنجی


دکتۆر صەباح بەرزنجی


مامۆستا کەیوان ئازاد ئەنوەر


دکتۆر هەڤاڵ خورشید رەفیق

أول حائز على شهادة الدكتوراه في التربية الرياضية

یەکەم پێشانگای تەخریمی مێژوویی

خوێندنەوەیەکی مۆزاییکی قەیرانی دارفور



بەرزان مەلا ئەها : با (کەلەیم)ی شاعیر و ئەدیب لە یاد نەکەین



ئاسۆ شێخ کمال :

هؤلاء هم رجال الدين !!

دیدارێک لەگەڵ هونەرمەندی شێوەکار (محەمەد فەتاح)



مایکل مور کاندیدکردنی فیلمی (فەهرنهایت 11/9)

بۆ خەلاتی ئۆسکاری ڕەتکردەوە



(سرووت)

دوو ساڵ لە پێش (لڤین)ەوەیە



مستشفى أمريكي يسمح بزراعة الأعضاء عبر الأنترنيت



# 10-11

سالی سێ یەم
بەهار و هاوینی ٢٠٠٤

## گۆڤارێکی گشتی سەربەخۆی وەرزییە


خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەر
بەریوان مارف حەسەن
07701488885
0731115351

جێگری سەرنووسەر
شەماڵ عوسمان
07701504777
0731120543

بەڕێوەبەری نووسین
حەمەعەلی کەریم
07701396577

دەستەی ڤاوێژکاران
هێمن سەلاح
د. کاروان رووف
م. جوانە مەحموود

دەستەی نووسەران
بەرزان مەلاتەها
ئالان جەمال
ئیمان کەریم
م. عەبدوڵڵا عومەر
کاروان قادر

ڤاوێژکاری یاسایی
پارێزەر
هەرسین سەلاح ابوبکر

پۆستی ئەلکترۆنی
srutmagazin@yahoo.com
srutmagazin@hotmail.com

ناونیشان : کوردستان - سلێمانی - شەقامی ئۆرزدی - بازاری لانە - نهۆمی دووەم

| دیزاینی بەرگ | دیزاین | چاپی بەرگ | چاپخانە |
|---|---|---|---|
| ئەندازیار سامان محەمەد ساڵح | کۆمپیوتەری تابلۆ | چاپخانەی کارۆخ | چاپخانە و ئۆفسێتی پەیف |

جگە لە سەرووتار سرووت بەرپرس نییە لەو بابەتانەی کە تیایدا بڵاودەکرێنەوە

بڵاوکراوەکانمان لە کتێبخانەی جوامێر لە رانیە و ئازادی لە حاجیاوا و بەدلیسی لە بەغدا دەست دەکەون

تیراژ : ٤٠٠
نرخ : ١٥٠٠ دینار

# لەم ژمارەیەدا





# بەیڤی سرووت

## سەرنووسەر

### مافی مرۆڤ لای ئێمە

مافی مرۆڤ لەبازنەیەکی دیاری کراودا نەسووڕێتەوە لە جیهاندا بەگشتی ولەلای خۆشمان بەتایبەتی ، لەسەر ئەم وشکانییەی کە ئێمەی لەسەر ئەژین یاسای دەریا جێبەجێ دەکرێت ماسی گەورە ماسی بچوك ئەخوا و دەسەلات دار وخاوەن پلە وپایەکان هەچ کاتێك تووشی کارەساتێکی گەورە هاتن دەست بەجێ مافی مرۆڤ دێننە پێشەوە و دەیان پارێزەر و مافناس پەیدا ئەبن بۆ پشگیری کردنیان و کەم کردنەوە و سوك کردنی تاوانەکانیان و زۆر بەکەم سەیر کردنی ئەو تاوانانەی کە کردویانە ، وەپشگیریکردنیان لەناوەوە ولە دەرەوە وە لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندندا وە جاری واش هەیە بەزیادەوە هەقیان دەدەنێ کە هەقی خۆیانە کۆمەڵ کوژی و وێرانکارییان کردووە وە بە کاروباری ناوخۆیی باس ئەکرێ وە ئەوانەشی کە بەم بیانوانەوە ئەسوتێن و لەناو دەچن بە سەرپێچیکار و لەیاسا دەرچوو ناویان دەبەن ..!!

وەك دەبینین کە دەیان پارێزەر قوت بوونەتەوە و بەوپەری قەناعەتیانەوە داکۆکی لە و تاوانانەی کە سەدام کردوویەتی دەکەن جالای خۆشمان بۆ چەند ساڵێك دەبێت مافی مرۆڤ وەزارەت و دەزگاو دامەزراوەی زۆری بۆ دانراوە وە خوا هەڵناگرێ جار بەجار باس لە گۆڕی بەکۆمەڵ و ئاوارە وئەنفال ئەکەن وە هەندێ شتی کەم وبچوکیشیان لەم لایەنەوە کردووە وەکو هێناوەی ئەرم وپێدانی بڕێك پارە بە خێزانی ئەنفالکراوەکان و شەهیدان ... هتد .

بەلام ئایا ئەمە چارەسەری تەواوی مافی کۆمەڵ ئەکات ، بەپێچەوانەوە ڕەگە لەم لایەنەوە هەتا ئێستا ( ١٠٪ ) کێشەکان چارەسەر نەکرابێ بەڕاشکاوی ئەڵێم کە مافی مرۆڤ و دام ودەزگاکانی زۆر دەستەو سانن لە ئاستی کێشەی کۆمەڵگاکەماندا ئیتر یان دەسەلاتی هەر ئەوەندە پێدراوە یاخود خۆیان کەم تەرخەمن لەکارەکانیاندا ، هەر کاتەکان بەسەر ئەبەن بەکورسی و پلە و پایە زیادکردنی پارەکانیان بۆ دوا ڕۆژیان ، یان مافی مرۆڤ ئەوەندەی کەبەدوای گۆڕی بەکۆمەڵ و مەسەلەی ئاوارە و...هتد دا دەڕۆن با کەمێکیش ئاوڕێك بدەنەوە لەخەلکی شار وگەڕەك وناوچەکانی خۆیان تا ئەمانیش بەبێ نەخۆشخانە قوتابخانە و ئاو وئاوەڕۆ و کارەبا و ڕێگاو بان کارەساتی مرۆیی خراپیان لێ نەکەوێتەوە یاخود ڕۆژانە سەردانی فەرمانگە و شوێنە فەرمییەکان بکرێت لەگەڵ ڕێزماندا بۆ هەندێکیان کە چۆن وەلامی مرۆڤ !! و هاولاتی خۆیان دەدەنەوە .. یان سەردانی بازاڕی بەناو ئازاد بکەن کە تەنها بازاڕی ئازاد نییە ! چونکە هیچ بنەماو پرەنسیپێکی بازاڕی ئازادی تیادا بەدی ناکرێت ، کە تێیدا چۆن قوڵی مرۆڤ ئەبڕدرێ و هەرکەس بەئارەزوی خۆی کالاکان دەفرۆشێت بەبێ ئەوەی هیچ چاودێرێکی ئەمافی مرۆڤ ئەهیچ دامەزراوەیەکی حکومی تری بەسەرەوە بێت ، مەگەر ئەمانەی کە باسم کردن ناچێتە چوار چێوەی مافی مرۆڤەوە کە یەکێك لەبەندەکانی لەم بارەیەوە دەدوێت لەکۆتاییدا دەڵێم ئەوهەندە لێپرساوانەی ئەمڕۆ کە پێشمەرگەی دوێنێ بوون ڕۆژی واهەبووە دەیان دێ ودۆڵ و شاخی کوردستانیان بەپێ ئەبڕی و بەنانی وشك وساوەر بەسەریان ئەبرد و شەویان لە ئەشکەوت و دار وبەردا بەسەر ئەبرد ، با ئەمرۆش بەمەوتیکا وبەخواردنی باش و جێگەی نەرم وگەرمەوە سەردانی ناوچەو گەڕەکەکانی شار بکەن ولە ماف هاولاتیان و خەلکی خۆیان بپرسنەوە .




# هەوڵێك بۆ شوناسی مرۆڤ و دەوروبەر



مەسعود محەمەد



عادل شاسواری







ناوی کتێب : مرۆڤ ودەوروبەر ــ بەشی یەکەم

نووسینی : ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کورد

مەسعود محەمەد

چاپ : چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ــ بەغداد

ساڵ : ١٩٧٧

دەزگای چاپ وبڵاوکردنەوە : لەچاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، لەکتێبخانەی نیشتیمانیدا ژمارە " ١٣٩٧ " ی ساڵی "١٩٩٧" ی دراوەتێ

تیراژ : ١٥٠٠ دانە

لاپەڕە : ١٧٦

تێبینی : هەمان کتێب و بەش هەر لەلایەن نووسەرەوە پاش دەساڵ بەزمانی عەرەبی چاپ و بلاو کراوەتەوە .

نووسەری ئەم کتێبە خاوەنی بەرێکی ڕەخنە گرانەیە لەسەر فیکرە فەلسەفەیی یەکان ، کەم وزۆر لەم بوارەدا نووسراوی بەر چاو ئەکەون ، بێجگە لەکتێبی ناوبراو وەك :

١- بۆ ئەمیری حەسەن پور لەهەر کوێیەك بێت

٢- هموم الحیاه

٣- الی غورباتشوف تحیه ورجاو

٤- بیروستریکا غورتشوف نقداً وتحلیلاً ج ١ ، ج ٢ .

٥- حاجی قادری کۆیی ( سێ بەرگ ) بەدەر لە لێکۆڵینەوە ئەدەبی کۆمەڵایەتیەکەی ڕەخنەی فەلسەفییە .

لەبواری زمانەوانیشدا چەند لێکۆڵینەوەیەکی هەیە وەك :

١- زاراوە سازی پێوانە .

٢- بەرەو ڕاستە شەقامی ئاخاوتنی کوردی

٣- مۆرفیم چمیان بۆ دەکات .

٤- چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی ..... و چەند نوسراوێکی تر .

تەوەرەکانی مرۆڤ ودەوروبەر لەڕووی فۆرم و فیکرەوە .

١- لەڕووی فۆرمەوە : مەسعود محەمەد وەك نووسەرێکی لێکۆڵەر هەر لەسەرەتاکانی نووسینیەوە لەبواری لێکۆڵینەوەی فیکردا بەوە ناسراوە کەخاوەن بینینێکی درێژ وپەلهاوێژێکی بەرین کارە ... بەوەی کە قەت گرێژنەکانی بەش بەش ناکات بەسەر چەند تەوەرەیەکی لەیەك جیادا بەڵکو بۆ سەرجەمی توێژینەوەکەی تاقە ــ سەر بابەتێك ــ هەڵدەبژێرێ و ئیتر هێندەی گرنگی بەقوڵ بوونەوە ئەدات لەو باسەیدا ناکۆشێ بۆ بڕین وپەرت کردنی دیراسەکەی بەسەر چەند تەوەرەیەکی سەرەکیدا کە لەنێو مەداری لێکۆڵینەوەکەیەوە گشتگیریان بکاتەوە بەڵکو وەك خۆی ئەڵێ : نووسەر هەیە مەوزوع بڕ بڕ وکەرت کەرت دەکات وەك قەساب دێت وکە لەشی کوشتەی پەل پەل دەکات ... ئیتر هەر کەرتە وهەر پەلەیە خۆی لەژێر ناونیشانێکی سەربەخۆدا دەبینێتەوە ، نووسەریش هەیە بەپێچەوانەوە ، سەر لەبەری نووسینەکەی دەخاتە بەر یەك نیگای بێ بچرانەوە ...

هەر نووسەر بۆ خۆی دەڵێت : زوربەی نووسینەکانی عەباس مەحمود عەقاد و تەها حوسەین لەم جۆرەی دووەمن ، زووربەی نووسینی قوتابخانەکانیش حەز لە پەل پەل کردنی بابەت دەکات .

بێ گومان نووسەریش هەر هەمان شێوازی دووەمی ڕەچاو کردووە لە سەر تاپای نووسینەکانیدا و هەرگیز کەرت کەرتی بابەتی نەکردووەتە خەسڵەتی لێکۆڵینەوەکانی .

جاهەر لەم ڕووەوە ــ فۆرم ــ یەك لە قورسیەکانی خوێندنەوەی بابەتەکانی لەلای خوێنەر تواندوتەوە نێو ووزەی بەردەوامی بوون ودرێژەدان بە مەوزوعەکان ، جیا لەوەی کە خاوەن خامەیەکی وەك مەسعود محەمەد ئەگەر خاوەن شێوازی یەکەم بوایە ، پێمان وابوو سیمایەکی تری ئەدایە نووسینەکانی و خوێنەر هێندەبەسەرسوڕمانەوە ماندوو نەئەبوو پاشان بەگرێ دانی بتبەت وبیرچوونەوە وسەرلەنوێ تێ هەڵچوونەوەی خۆی نەئەخستە پشت نەخوێندنەوەی بابەتەکەیەوە ، ئەمە ڕوویەك ، ڕووی دووەمیشی ئەوەیە کە بێ گومان بواری فیکری پتەوی و ڕۆچوون لەنێو مەداری فرە بابەتداهەروا لەهەموو مرۆڤێك ناوەشێتەوە و بۆ هەموو جێگایەکیش سانا بەدەستەوە نایەت ... چ جای سەر لەبەر یەکی وەك ئەم تەرزە نوسراوانە کە خوێندنەوەی خود بەخودی لێ دەرکە ئەوە مرۆڤ نی یە بتوانێ لە خۆشەویسترین دۆستیشی توانای بیستنی چاردەکێکیشی هەبێ چ جای نیوەی یان سەر لەبەری وە یان لەرادیۆوە یان دەزگایەکی تری چاپ و بڵاو کردنەوەی وەکو ڕۆژنامە وگۆڤار کەهەر بۆ بڵاو کردنەوە دەست نادەن.

بۆ یە ئێمە پێمان وایە ، نوسینێکی ناوەها ئەگەر شێوازی تەرزی نووسراوەکەیی ئاو بەڕین و بێبڕانەوە نەکردایە .. هەم جەماوەریشی زیاتر ئەبوو ... هەم خوێنەریش کەمتر لەگەڵ تێگەیشتندا گیانی ئەدا .

ب - لەڕووی فیکرەوە : تائێستا ئەم کتێبە دووبەشەی کە بەر دەست ودیدەی خوێنەر کەوتوون سێ ئەوەرەی سەرەکی لەخۆ گرتوون :

١- بەشی یەکەم : لە پەراوێزی زاتیەتی مرۆڤ ، بەشێوە بنچی باسی ڕووی ئیجابی هۆشی کردووە ، کەدەکاتە ڕووی تێگەیشتن و بۆ چوونی ڕاست ولێکدانەوەی ژیرانە .

٢- بەشی دووەم : دێتە سەر باسی دەوری سەلبی هۆش ، کە بەباوەڕی ئەو سەلبی ناوی خۆی هەڵگری سەرشانی خۆیەتی و بیحگە لەماڵ وکاولی و ڕەنج بەخەساری و بەفیڕۆ ڕۆیشتن بەو لاوەی تیا نی یە .

٣- بەشی سێیەم : زیاتر باس لە عەقڵانیەت و بەئاشکرا تر باسی علمانیەتی مرۆڤ و چەند لاباسێکی تر دەکات .

تێ بینی / ئەوەی ئەم خوێندنەوەیەی ئێمەی لەخۆی گرتووە : تۆزێ هەڵدانەوەیەکی ئەخێرا ونەهێمنی بەشی یەکەمی نووسینەکەیە .. کەم وزۆر ئەوەندە دەهێنێت وەك مناژەرەیەکی فیکری کەمێ گوێی بۆ شل بکرێت و لێی ڕابمێنین.

لەسەرەتاوە پێویست ئەکا ئەوە بڵێین کە نوسەر لەبواری بڕیاری ئەم لێدوانەیدا لە فیکر ئەگەڕێتەوە سەر نێو بەندەکانی دێڕی لاباسێکی گرنگ لە چاپکراوی حاجی قادری کۆیی کە یادگاری خۆیەتی و سەر هەڵدانی فیکرەکە بەوەوە دەبەستێتەوە .. ئەمەش یەکێکە لەشێوازی نووسەرانی جیهانی کە هەمیش ئەڵقەیەکی هاوبەش دروست ئەکەن بۆ بەیەکەوە بەستنی نووسینەکانیان بۆ ئەوەی هەرچی زیاتر خوێنەر لەهەر نووسینێکیاندا کەمەندکێش بکەن بەدوای ئەوانەی تریاندا کە نەیبینیوە وەنەی خوێندوتەوە یاخود بەمانایەکی تر دەری خەن کە ئەوان لە نووسینەکانیاندا بەرنامە ڕێژیەك و تەواو کاریەك هەیە .

**پۆلێنە کردنی بەشی یەکەم لە کتێبی "مرۆڤ و دەوروبەر"**

- مرۆڤ ودەوروبەر ــ بەشێوەیەکی گشتی هەر لە ١٧٦ لاپەرەکەی دەبێتە چەند ــ بەشەوە ، کەلەماندا خۆی دەبینێتەوە :

* کارتێکردنی دەوروبەر و سروشت لەلای نالی و پێچەوانەکەی لەلای حاجی قادری کۆیی ، وەرچەدانەوەی بیری ماددی بۆ کاریگەرایەتی ئادامیزادی هەستیاری خاوەن ئیرادە و هۆش و سەدان تایبەتی سەر بە مرۆڤایەتی ..

* لێرەشدا ئەڵێ : مـن هەگیز ناڵێم قناعەت بەهیچ کەس وهیچ شتێك مەهێنە ، بەڵکو حورمەتی قناعەتت بگرە بەوەدا کە هەڵمەت بەیتە سەر ئەو چەوت وچوترییەی لەو فەلسەفەیەدا دەیدۆزیتەوە کە کردووتە بە نێرتێکی قناعەتت ( واتە بەڵگەی قناعەتت ) ، پێشتریش نارەحەتی خۆی بۆ ئاپۆرای ئەو ڕۆشنبیران و ئەدیبان وهونەرکاران و شۆڕشگێرانە دەربڕیوە کەدەبینێت بەدەست خاوەن فەلسەفانەوە وەك قورە چەورەیان لێ دێت هەر ساتە بەپێی ئاوازگۆڕی ئەو فەلسەفانە ئەوانیش کورتر ودرێژتر دەبنەوە و لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر ئاناسرێنەوە .

لێرەوە ــ لاباسێکی گرنگ ــ گوریس کێشەکێی( مادە ومرۆڤ ــ سروشت وهۆش ) بەرە ولای خۆی ڕادەکێشێ .بەڵام هێندە گوریس بچڕێنەی فیکری وسەر لەنوێ گرێدانەوە پاشان بەدوادا چوون و دیسان هەڵکرتنەوەی تیایە ..





بیری دوێ نسـوێ .. فیکـری دوێ موتالاکات .. حەوسەڵەی دوێ بەنێرتك .

لە لاپەرە ( ١٤ ) دا دەڵێ : (( ئەوەی راستی بێت من تارادەی شەیدا بوون حەز لەپوچانەوەی هەڵەی پەرسەندوو دەکەم )) .

بەمەرجێ بۆخۆی خەریکی هێنانە دونیای نووسینی چەند هەڵەیەکی هێشتا چاو نەتروکاوون لەبواری شێوازی تەحلیلیە وکە سەرە دەزووەکەیان بەم بێ ڕێسابیە ئەگیرسێتەوە لە بـواری نووسـیندا ، کە لەهەڵـەی پێداچونـەوە و دانەرشتنەوەی نـوێی بابەتەکـەی زیـاتر لـە هیـچ سەرچاوەیەکەوە رێچکەی نەگرتووە .

بۆیە هەمیشە خوێنەر واڵێ دەکات جارێکی تـر لاپـەرەکانی بخوێنێتـەوە تـا لەتاریکی تێك هەڵچرژاندا چاوانی تەلەزگە نەکەن .

خۆتەگـەر ئـەو خسـڵەتە رەنگـی نووسـینەکەی نەرشتایە ئـەوا بابـەتێکی رەخنەیی باش بوو ( بەپێی ئەو زەمەنەی ئەو بابەتەی تیـا نووسـراوە ) سـەبارەت بەرەخنەی فەلسەفەی مادی .

تا لاپەرە ( ٢٠ ) درێژە بەوە دەدات ـــ جەغزی رەهـایی فیکـر وپوچانـەوەی قـالب بسـتن و شـەختە کردنـی فەلسـەفە تاچـەند هەم رەهایی فیکر بێ سنوورە و هەم قـالب بستنی فەلسەفانیش .

لە لاپەرەکانی پـاش ئەویشـدا قـەدەرێك باس لەبۆ چوونەکانی ماددی دەکات لە چاو هـەندێ لـە ئـەدگار ونـەریتی ئـاینی نێـو کوردەواری پاشان بـەبێ ئـەوەی خـەتێك لـە نێوان مـاددە وغـەیبدا رابکێشـێت هـەوڵی داوە ئـەو شـتە نامادییـە کاریگەرانـەی کۆمەڵایـەتی ومێژوییـی کەنیسـلام وەك رێباز لەنێو مەزاری دەرونی مرۆڤی کورددا یان عەجەمدا چەسپاندوویەتی کە فیکری ماددی حەزیان لێناکات و دەیەوێ دەوریـان کەم بکاتەوە یان هەر بەجارێك نەیسەلمێنن وەیان هەر نەبێ بەتەئویلات بۆ بەر حوکمی خۆی بیانگەرێنێتەوە / ئەم / تـا رادەی قەناعەتی خـۆی ئەیانخاتـەوە جێگـەی رەوای خۆیان .

پاش ئەوەی دێتە سەر ووتارێکی د.فـواد زەکەریا لە ژێر ناونیشانی " مارکس أفیون الشعوب " کە لەگۆڤاری ـ روزالیوسف ـــ رۆژی ٢/ ٨ / ١٩٧٤ ی ژمـارە " ٢٥١٢ " بلاو کراوەتەوە .

وە بەپێی بۆچوونی خـۆی وناسـتی تـێ گەیشـتنی لـە هەرسـێ ئـاینی ئیسـلام و مەسـیحی وجولەکـە و پاشـان مـەودای تەلەزگە دان لە نێو بابەتەکەی د. فواد دا و رەنـگ دانـەوە و قسـە لەسـەر کردنـی لـە مەصردا لێ ی دواوە .

بەلام ئەوەندە هەیـە کـە بابەتەکـە وەکو دبـارە لـە سـەر ووتـەکانی " مـارکس " ە وەرۆشنایی وەرگرتـووە کـە بـە ئینگلیزی و روسی نوسراوون کەچی د. فواد تەرجەمـەی کـردوون وە یـان بەتەرجەمـە کـراوی نـەقلی کـردوون بوتێـو گۆڤارەکـە بـەلام مەسـعود محەمـەد کـاتێ رەخنـەی لێ ئـەگرێ هیـچ وەرگێرانێك پیادە ناکات لە نووسـینەکەداو دەق وەکو خۆی بەعەرەبیەکە نوسیوویەتیەوە وە لە پاڵیشیا بەکوردی رەخنەی لێ گرتووە.

لە شوێنانی تری نوسیەنەکەشـدا دەقـی فارسـی بـەرچاو دەکـەون و بـەبێ تەرجەمـە کـردن بـەکوردی رەخنـەیان لێ ئـەگرێ ... ئەگەر لێرێشی بپرسـی ئەمـە چۆن کـراوە ، وەکو لە کۆرێکدا لەبەغدا روونی کردوتـەوە ئـەوا ئـەڵێ : مـن بـۆ سـەرووی خـاوەن بڕوانامـەی بـەکالۆریوس دەنووسـم و زۆرتـر دکتۆر وهەلگری بڕوانامەی ماجسـتێرەکان لە نێـو کـورددا بـە خوێنـەری نوسـیەنەکانم دەزانم ..

دەخۆ ئەگەر لێشی بپرسی باشـە مـادام وایــە : ئـەی بۆچـی کتێبەکـەت تـیراژی ( ١٥٠٠ ) دانەیە خۆ بەدڵنیاییـەوە خـاوەن شـەهادەی دکتـۆرا و ماجسـتێر لـە سـاڵی " ١٩٧٧ " دا لـە کـورددا مەگـەر هەندەرانیشـی لەگـەڵدا حیسـاب بکـەیت ، ئەگینا ١٥٠٠ کەس نەئەبوون .

لەلایـەکی تریشـەوە مرۆڤ کـە دەسـت ئەبات کتێبێـك بخوێنێتـەوە بـەپێی زمـانی کتێبەکە هەرچیەك هەیە لەوەوە ئەرواتە نێو باسـەکە و مـەرج نییـە بەهـەر سـێ زمانی کوردی وعەرەبی وفارسـی فەلسـەفە بخوێنێتەوە .

هەرچەندە رووی تەنگی ئەو ووتەیەیشـی لەوەشەوە کەلەبەری تیایە کە ئەشێت هەندێ ئـاوا قـورس کـاری زەق لەنوسـینەکەی دەر بهاوێژرێت و پۆلینێکی ئەکادیمی بکرێت ، بۆ فێر خوازی پلەکانی ئامـادەییش دەسـت ئەدات ئەگەر نەڵێین بۆ ناوەندی ...ئەو سـەر پۆش کردنە گەورەیەی کە مەسـعود محەمـەد لە نێو بابەتەکـەی د.فـواد کەشـفی ئەکات ئەوەیە کە د.فواد لەبەر خاتری ئـەو هـەموو موسـوڵمانەی لـە رۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت و میصر دا هەیە ئەڵێ : مارکس شتێکی وای لـە ئـاین ئـەزانیووە تەنـها لـە جولەکایـەتی کەمێکی بینیوە و زوڵمی کە ئیشەیش

ئاوا کارێکی لێ کردوە کە بلێ : دین ، أنه أفيون الشعب .. تێبینی کە بەکار هێنانی ووشەی گەل لەلای مارکس بە شێوەی مفرەدە نەک جمع واتە کۆ ، وەکو باوە ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی زەمەن و شوێنێکی تایبەتی مە بەستە ، ئەمە د.فواد وا ئەڵێ ؛ مەسعود محەمەدیش ئەڵێ باوەڕناکەم هیچ ناحەزێك بەچاوی کراوەوە تا ئەم رادەیە مارکسی لە پلیکانەی فەیلەسەفایەتیەوە هێنابێتە خوارەوە ، هەر نەبێت لەبەر حورمەتی خۆی نەکا لەنەزەر خەڵك بە مرۆڤێکی نیوە خێندوو دەرچێت.

پاش ئەوە وەڵامی ئەو ڕایە ئەداتەوە کە ئەڵێ ئاین دڵخۆش کەرەوەی هەژارە ، بەچەند بەڵگەیەکی عەقڵی کە نە ئەبوا دەوڵەمەند ڕێی لە ئاین بکەوتایە مادام ئەو بۆ دڵخۆشی هەژاران بێت ... کەچی لەسەرەتاوە زۆر پێچەوانەیە وئێستاش هەر پێچەوانەیە هەرچەندە ئەمە تێچبێتی تریشی لەسەرە کە پێچەوانەکەی بەراست ئەزانن .

پاش ئەو پەرانە لەسەر پێشەوایانی ماددی نێو سیاسەتی کورد دا باس دەکات کە وا نەیانوێراوە بڵێن ئێمە کوردین ، بەڵام بۆ خەڵکی تر کورووزاونەتەوە بەحوکمی ئومەمی بوونی فیکرەکەیان ... لە دوایشدا بابەتی ـــ سەر کوتەڵەکەی ماوە پێمانی بهارێن ـــکە لەگۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە " ٤٢ " ی تشرینی دووەمی ١٩٧٦ بڵاو کراوەتەوە کەمێك لەسەر ئەو کورد بەکەم زانینە ئەدوێ ...

مەسەلەی ( پەراوێز ) یش ئەو ئەمەش هەر تێهەڵکێش ئەکاتە نێو ڕو بەندیە یەکبارچەییەکەوە هەر بۆ یە زۆر جاران لە مەوزوع دادەپچڕێت و ئیزن لەخوێنەر وەر دەگرێ بەدوای قسەیەکی لاوەکی بکەوێت پاش گەڕ گەشتێك چەند لاپەڕەیی بابەت خە ریکە وون ئەبێت جا خامە سەر دەکاتەوە و بەسەر دەزووی ڕابردووە وە گرێ دە درێتەوە.

لە لاپەڕە ( ٤٧ ) بەو لاوە برێك باسی بوونی زاراوەکانی ــ وجود بالقوە ووجود بالفعل ــ ئەکات و ڕوو بەڕووبوونەوەی مادە وهۆش لەبەر تیشکی بوونی لایەکیان و نەبوونی ئەوی تریان ڕوون ئەکاتەوە تا لاپەڕە ( ٥٤ ) دا سێ کوچکەی ( سرووشت ، گیان لەبەر ، هۆش لەبەر ) بەپابان ئەگەیەنێت و لە لاپەڕە ( ٥٥ ) وە باسی " چین " و " چینایەتی " ئەهێنێتە ئاراوە ، ڕای خۆیشی لەسەری کەم و زۆر درێژە پێ دەدات ، گەر موڵەتمان هەبێت وێنەیەك لە لاپەڕە ( ٥٦ ) دە خوێنینەوە کە دەڵێ : شتێکی کوتایی ساڵەکانی چلەکانم بیر دەکەوێتەوە کە ستالین لە شێوەی ( أمر إداري ) فەتوایەکی دەرچواند بەسەر زیرەکی و زەکای مرۆڤدا وبریاری دا پلەی زیرەکی تاکان لە بنە ڕەتدا وەك یەکە ، بەڵام جیاوازیان چین و پەروەردە بوون لێکیان دوور دەخاتەوە . لەم فەتوا سافیلکەیەدا کە چ پەیوەندی بە ڕاستی و و بەبەر ژەوەندی مرۆڤیشەوە نییە هەر ئەوەم مەبەستە کە ئەگەر خاوەنی فەتواکە بڕوای پێی هەبووبا دەبوو خێرا بەخێرا واز لەو ڕابەرایەتییە زندە زەحمەتە بهێنێ کە بەئەستۆی خۆیەوە گرتبوو چونکە لە سەرەتای ژیانی خۆیدا بەهەژاری ڕابوواردبوو بۆیە ڕێك نەکەوتبوو لە ڕێی پەروەردە بوونی تایبەتییەوە ، بەپێی قسەکەی خۆی ، زیرەکییەکەی بەرە وپێش بچێت ئیتر بۆ دەبێ یەکێکی خوا پێداو و دڵسۆز نەدوێزێتەوە و دەسەڵاتی ڕابەرایەتی و بەڕێوە بەرایەتیەکەی خۆی پێ نەدات ؟ .

گەر تێبینی سەرەتای هێنانەوەی مەقولەکەی ستالین بکەیت لەلای مەسعود محەمەد وەك یادەوەرییەك بۆمان ئەخاتەوە کە لە ژیانێکی ئاسایی وبێ دووری شوێن و جیاوازی زەمان ڕووی دابێت و زۆر ساناش ئەڵێ : شتێکی کوتایی ساڵانی چلەکانم بیر دەکەوێتەوە کە ستالین وای ووت .

کە ئەم ئەدگارەیش وەك شێوازێکی بەدەر لە ئەکادیمی نووسینی لێکۆڵینەوە ئەدرێتە قەڵەم ، کە ئەبوا پێش هەموو شت ڕۆژو بەروار و شوێن وجێگای بڵاو بوونەوەی ئەو مەقولەیەی باس کردبا جا ناوی بهێنایە ، کە چی ئەم نووسەرە شێوازی ئاوا دەگمەن زۆر دووبارە ئەکاتەوە و کەم وکەسێکیان نەبێت ، سەرچاوەکان ڕوون ناکاتەوە ڕەخنەکان دەگرێت ، لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەش بێ زۆرێك لەو شتانەی کە لە دنیای فەلسەفەدا مەسعود محەمەد وەڵامی داونەتەوە یان ڕەددی کردونەتەوە لە دنیایفیکردا جێیان نەگرتووە وتا ئێستاش لەلای نووسەران و خوێنەرانی کورد دووبارە نەکرێتەوە .

ئەم سەرەڕای ئەوەش کە ئەو گەر تێبینی دێڕی ( ١٥ ) بکەیت کە وەسفی بڕیارەکەی ستالین دەکات بە " فتوایەکی سافیلکانەی " لە قەڵەم دەدات .. کە ئەم شێوازی سوکایەتی پێکردنەش بە مەقولەی هەر کەسێ بێ پێش ڕەخنەیەکی مەوزوعی لە ڕاستیدا ئەو ڕایەکی زانستی وشێوازێکی،

فەلسەفی نییە ، چ جوانە ! تۆ ڕەخنە لەهەر فیکرێك بگریت ، عیلمی بێت نەك عاتفی ، هەروەك هەر شتێك ڕەدد ئەکەیتەوە پێش سوزو حەزت عەقڵت بەبەڵگە وفیکرت بە مەنتق ڕەددی کردبێتەوە .. جاتۆیش ڕای خۆت بڵێ ، نەك وردە ووشە لە زاری خامەت سەردەرکەن پێش ڕەخنە یەکی پەسەند و قوڵ .

چونکە ڕێزگرتن لە بەرهەمی ڕەخنە لێ گیراو نرخێکی گەورەتر بە بەرهەمەکەت ئەدات ، بەوە دا دەر ئەکەوێت کە تۆ ڕەخنە لە شت ئەگری نەك لە هیچ ئەگێن هیچ بۆخۆی لەقاڵبی نەبووندایە هەر بۆ شاییەکە وبەبێ ڕەخنەش زەمەن پوچی ئەکاتەوە نەك زەمانە .بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئێمە وەك ئەو مەقولەیەی ستالینمان بەلاوە زانستی بێت !! .

پاش ئەوە دێتە سەر نە بوونی ئیادە لە نێو دنیای ماددەدا چ وەك ماددەی مردوو چ وەك ماددەی زیندوو ـ، دواتر ووتەیەکی برنادشۆ لە وەسفی مارکسدا دە هێنێتەوە کە ووتوویەتی : یەکەم مرۆڤە بەسەر بەرزایی نەفسی خۆیەوە ، دەنا گەلێك کەسی دیکە هەیە لەسەر سەکۆیەکی زانستی یەوە بە نێر و بەرزتریش وە ستاوە .. پتر لە ڕاستیەکانی جیهانی زانیوە ، بەلام جیاوازی ئەم دووانە لەوەدایە مارکس دەگەرێ بەدوای لابردنێکی باوەڕ ودانانی یەکێکی خۆی لە جێگەیدا وەك : هێرشە مەشهورەکەی بۆ سەر یاسا ئابووریە بدیهیەکەی ( عرض وطلب ) کە هێندەی گەرمای هاوین وسەرمای زستان ئاشکرایە کەچی مارکس هات ویاسایەکی وەها زاتی خستە جێگەی ئەو" موضوعی " بەوە بەو دا کە نرخی شتانی گێڕایەوە بۆ ئەو ئیشەی لێوەی خەرج کراوە .. کە ئەگەر باوەڕی پێ بکەین دەبێ کیلۆێ قارچك بەیەك نانە بێت .. ئەو گلەی لەکاتی دۆزینەوەی ئەلماسدا هەلی دەکەنین دە بێ ئەویش بەنرخی ئەلماسەکە بێت .. چونکە قارچکەکە خۆرسکە ولە مەسرەفی گوێزانەوەی پتر تێ‌تە چووە .. خۆڵەکەش بە قەدەر ئەلماسەکە ماندوو بوونی ویستووە

هەر لەسەر ئەم زاتی بوونی مارکسە وە لە لاپەڕە ( ٧١ ) دا سەر دەکێشێتە نووسینێکی لینین و برنکیش باس لە زاتیەتی ئەو دەکات ..

پاشان دەڵێت : نامەوزوعیەتی ئەم باوەڕە لەوەوە دێت کەوا نەخۆی ئەو چاکە و ئەو ڕاستەیە کە ئیدعای دەکات ، نە غەیری خۆیشی هەموویان ئەو بەدە و نە هەڵەیەن کە لێی کردوون بە تەمغەی حەتمیەت .

لە لاپەڕە ( ٧٩ ) دا لەئاست موناقەشەی هەندێ بیەو باوەڕی پێوانە کردنی مادیانە بۆ شت هەندێك دیتر نەخوێنیتەوە کە لە لاپەڕە ( ٣٢ ) ی مەرگی سێ یەمی حاجی قادرەوە ڕاگوێزانی بێکردوون لەوانە : مرۆڤ وماددە .دواتر کۆمەڵایەتی وموعنەوی پاشان ڕێز و ماددە ، لەوەوە نمونەیەك هەڵدە بژێرین کە لە لاپەڕە ( ٨٢ ) دا تۆماری کردووە سەبارەت بە نرخی ئاین لەلای مرۆڤ : ئەڵێ : بیستوومە لە ووتو وتژدا ووتراووە لە سالی گرانیدا قورئانیان بە نان دەدا ، بەمەشدا وا ڕا دەنواندرا کە حورمەتی نان لە قورئان پتر بێت .. هەڵبەت دەزانم نان وەهەموو هۆیەکی ژیان و گوزەران بەحورمەتە ، بەلام مەسەلەی فرۆ شتنی قورئان بۆ پەیدا کردنی نان لە سالی گرانیدا نرخە مەعنەوییە یەکجار گەورەکەی قورئان نیشان دەدات ، چونکە لەو تەرزە قات وقڕیەدا هەر زێڕ ومولك وشتی ئەو تۆی نانی پێ دەهات ، ئەگەر ئەولادت فرۆشتبایە کەس نانێکی پێ نەئەدا ، کەواتە ئەگەر ڕاست بێ قورئان نانی هێناوە دیارە گەلێك بەولای زێڕ ومولك و نانەوە بە حورمەت بووەلای ئەو کەسەی کڕیویتی چونکە قورئان نە دەخورێ نە لەبەر دەکرێ و نەهیچ جۆرە سوودێکی ماددی لێ پەیدا دەبێ ، ئەو کەسەی قورئانی لە سالی گرانیدا خستە تەرازوی نانە وە بۆچی ئەو هەڵسەنگاندنە لە سالی هەرزانیدا ناکات تا بزانێ یەك قور ئان چەند نان دەهێنێت.

لەکۆتایی ئەم بابەتە کۆمەلایەتیەدا و لە لاپەڕە ( ٩٣ ) دا ئەڵێ : زۆر جاران کە نووسەری ماددی کە دوچاری دیاردەی بە زاهیرنامادەی لە کۆمەلایەتیدا دەبێت بەسوك و ئاسانی خۆی نەزەریەکەی لەولەو نارەحەتییە ڕەها دەکات بەوەدا کە ئەڵێ : ئەم دیاردەیەش لە شی کردنەوەی نیهائیدا سەر بە مادیەتەوە دەنێت ..

کۆلێکیش کە یفی بەخۆی و قسەکەی دێت . دواتر دووڕەخنە لە خودی ئەو وەلامە ئەگرێ‌کە خاوەن فیکری شتان بەرەو بنجی خۆیان دەگەڕێننەوە لەو دەماندا کە پەکیان لەسەر سەلماندن ئەکەوێت ، ئەگینا مەبەستی لێکدانەوەی بۆ بنج گەڕانەوە ئەگەر سوودی مادییەتی تیا نەبێ ئەوا قەت ئەو پرۆسە بەئەنجام ناگەیەنن .

لە لاپەڕە ( ٩٤ ) دا لەسەر ئەم موناقەشەیە ئەڵێ : بەنموونە ئەڵێم : بابی ئەوەی کار دروستایی خۆی پەکی لەسەر یەکچوونی مرۆڤ دەکەوێت دەڵێت





میللەتان بەران ، بایی ئەوەی کار وبازارەکەی لە هێمنیدا ڕادەوەستێ قبوڵی نییە خەڵقی دەربوونەی شارێك برای یەکدی بنهەرچەند هیچ هۆیەکی ڕاستی ودروستی دوژمنایەتیش لە بەیندا نەبێت ، چەند سەیرە ئێمە هەموومان برای هەموو دنیا بین بەلاّم نەشێ نە ئێمە ونەهیچ میللەتێکی دیکەش لە نێوان خۆیاندا برابن بۆ ئەوەی بەقاڵێك وکرێکارێکی ڕواندوز شەڕی جودا وازی چینایەتی بکەن ، ئەوندە هۆیە بەسە کە کرێکارێکی ئەڵمانیا وسەرمایەدارەکەی لە یەکدی جودا بن .

لە لاپەڕە ( ٩٨ ) دا دێتە سەر مەوزوعێکی تازە کە ئەویش توێژینەوەی مەقولەیەکی بەناوبانگی مارکسە کە ئەڵێ : هۆی بەرهەم هێنان گۆڕا بە دوا ئەودا " پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان لە نێوان خەڵقدا دەگۆڕێت " و ئیتر واقیعی سەر لەبەری کۆمەڵ دەگۆڕێت تا لاپەڕە ( ١٢٥ ) ، درێژە بە شی کردنەوە ورەخنە لەو مەقولەیە ئەدات . پاش ئەوە ئەوە دەسەلمێنێ کە ترسی فەلسەفەی دوانەتی ( الثنائية ) ـ دوا لیزم ـ (( ئەو فەلسەفەیە کە فەیلسوفەکان بڕوایان بەماددە هەیە لە پاڵ ئەویشدا بڕواشیان بەلایەنی ڕوح هەیە ، واتە هەر دوو ڕوح و ماددە فاکتەری پرۆسەی پراکتیکە کردنی ژیانن )) ، ئەو ئەنجامە ڕامیاریە وئابووریە وکۆمەلاّیەتیە ی کە دەشێ لێیەوە هەستێتەوە هانی فەیلەسوفی ماددی سەر بەسیاسەتەوە دەدات کە دوانە تیەکە بپوچێنێتەوە لە ڕێی هێنانە خواری مرۆڤ و قابیلیەتە ( بەزاهیر ونامادییەکانی ) بۆ ژێر حوکمی ماددە ویاساکانی چونکە دیارە فەلسەفەی ( دوانەتی ) لە خاسیەتەکانی زیندوویەتی و هۆش و ئیرادە هێزی زۆر وەر دەگرێت .

دوا بەدوای ئەوە دێتە سەر توێژینەوەی مەقولەیەکی تری بەناو بانگی مارکس کە ئەڵێ : مرۆڤ بەنرخترین سەرمایەیە ـ کە تیایدا دە سەلمێنێ : کە مرۆڤ ناوی سەرمایەی لێ نرا خاوەنی لێ پەیدا دەبێت و وە دەستی بەسەردا دەگیرێت ئەوساش خاوەنەکەی چوتی بەلاوە بەرژەوەند دەبێت وەها ڕەفتاری لە گەڵدا دەکات .

پاش ئەوە لە لاپەڕە ( ١٤٢ ) دا تیشکێکیش ئەخاتە سەر ئەو ووتەیەی کە گرنگی بە جەنگی ناوخۆیی دەدات بۆ پاك بونەوەی میللەت و پاشان ئازاد بوونی ، گوایە هەموو شۆڕشی میللەتانی جیهان بە جەنگی ناوخۆیدا تێپەڕیان کردووە .

لە لاپەڕە( ١٥٠ ) بە دواوە توێژینەوەیەکی قووڵ لەسەر دەقێکی نەزەریەیەك ئەکات کە تیایدا ئاماژە بەناوی نووسینێکی لینین دەکات لە کتێبی " حکومەت و شۆڕش " کە ئەڵێ : لە کۆتەوە سەرەتای کۆمەلاّیەتی و پەیدا بوونی چینەکانەوە ، زوربەی ستەم لێ کراون خەریکی خەبات بوون بۆ ڕزگار کردنی خۆیان و لەناو بردنی ستەم کارەکان " ، مسعود محمد لێرەدا پرسیارێك ئەکات : ئایا بۆچی بەشێکی ئیجگار کەمی گەل توانیان دەسەلاّتێك بگرنەوە دەست وکە بتوانن ستەم لە سەرجەمی گەل بکەن ؟!

دوای ئەوە ڕەخنە لە نووسینێکی تری لینین دەگرێت لە کتێبی " حکومەت وشۆرش " دا کە ئەڵێ : پەیدا بوونی چینە جوداکان و داهاتنی چەوسانەوە لەکۆمەڵدا چینەکەی سەرەوە بۆ بەردەوام بوونی چەوسانەوەکە و پاراستنی دەسەلاّتی خۆی حکومەت دروست کرد و پۆلیس و عەسکەر وحەپس خانەی پێکەوە نان ، ڕۆژێکیش کە مرۆڤ گەیشت بەپلەی بەسەر چوونی چەوسانەوە ڕژێمی حکومەت لەخۆوە دەپوچێتەوە ، چونکە هۆی مانەوەی کە چەوسانەوەیە لەناو دەچێت . نووسەر سەبارەت بەم ووتەیە شی کردنەوەی زۆری کردووە کە تیایدا دەسەلمێنێ :کە بەدرێژایی مێژوو زۆردار دژی دادگا بووە چونکە دیارە نەمانی دادگا هەروەهاش نەمانی فەتوای مەلا وحوکمی ئیبنوحەجەر وکتێبەکانی سەر بەقورئان و حەدیس ، دەستی زۆردار ئەکاتەوە بۆئەوەی بێ ترس ستەم لەبێ دەسەلاّتان بکات ، هەر ئەمەیشە وا لە حکومەتی ستەمکار دەکات کەوا لەپێش هەموو شتێکدا دادگایان بێ هێز ودەسەلاّت بکات کە دیاری ترینیان ئەوەیە لە هەرەتی ستەمی حکومەتدا دەسەلاّتی عورفی بلاّو ئەبێتەوە کە نیشانەی نەمانی یاسایە .

بێگومان لێرەوە تا کۆتایی درێژە بەم بابەتە ئەدات و ئەوە ئەسەلمێنێ کەیاسا هەر چیەك بێت لەسوودی هەژار و بێ دەستەکانە نەك بە پێچەوانەوە ... نمونەیەکیش لە لاپەڕە( ١٥٤ ) دا جارێکیان هەژارێك و مام حاجیەکی مەیلەو دەسەلاّتدارشەرعیان هێنایە لای باوکم واتە ( مەلا محمەدی کۆیی ) ئەویش بیستنی قسەکانیان پێی ووتن ئەگەر بە" ئیبن حجەر " بێت هەق بەلای هەژارەکەوەیە ، ئەگەر بە " ئیبن خەنجەر " یش بێت دەسەلاّتدارەکە دەیباتەوە ، هەژارەکە بردیەوە چونکە ئیبن حەجەر کاری خۆی کرد .

لە کۆتایدا ئەتوانین بڵێین وەك خۆیشی کە لە لاپەڕە ( ١٦٩ ) دا ئەڵێ : تا ئێستا لەم نووسینەدا پێی گەیشتووین ئەویش کاریگەر بوونی زات وکار تێکرانی ماددە یە لەو ڕووەوە کە مرۆڤ خەڵقەندەیێکی زاتیە وهەرچی مەوزوعیەتێکی لێشی بەدی بکرێت هەر لە ڕێی تێکەڵ بوونی زاتی لەگەڵ دەوروبەردا پەیدا بووە و دەبێت ، لەوەش بەولاوە ماددە ناتوانێت ڕابەرایەتی و یەکەمینایەتی لە مرۆڤ بسێنێتەوە بۆ خۆی .

# بەهاكانی كۆمەڵگەی ئەمریكی ... بەرەو تێگەیشتنێكی تر



سەرنووسەر

بەشی یەكەم

میتۆدی ( پێكدادانی شارستانیەتیەكان ) ی صاموئیل هنتگتۆن بوە هۆی دروست بوونی وتووێژێكی زۆر لەسەر هەریەك لە ئاستەكانی سیاسی و ئەكادیمی ، وە ئەو پەراوەی ئەمڕۆ بووە باوترین وبڵاوترین نوسین چونكە دانراوە بە شرۆڤەكردنێكی ڕووداوەكانی جیهان .

وە زۆرێك لە نووسەران وەڵامیان داوەتەوە وە ئەو وەڵام دانانەوەش دووبارە كۆمەڵێكی تری وەڵام دانەوەی لێ كەوتوتەوە، جا ئەوەی كەمن لێرەدا باسی لێوە دەكەم بریتی نییە لە نمایشكردنێكی ئەو كێشەمە كێشە جیهانیەیە بەڵكو مەن لێرەدا مەبەستم تەنها تۆماركردنی خاڵكی مەنهەجیە كە دەمەوێت بیكەمە دەروازەیەك بۆ چونە ناوەوەی ئەوەی كە دەمەوێت تەرحی بكەم لەم نوسینەمدا .

كێشەی سەرەكی لە تەرحی هنتگتۆندا خۆی دەبینێتەوە لە تێكەڵەیەك لە نێوان ئاستەكانی شیكردنەوەدا ، ئەمەش بۆیە چونكە بیرۆكەی بوونی ئەمەتە شارستانیەتە جوداكان بیرۆكەیەكی نوێ نیە ، وە نمونەیشارستانیێتی ئاكاری شارستانیێتی ئاراستە دەكات بە ئاراستەی ئەوەی كە سروشتی ئەو شارستاتنیێتیە پێ دەبەخشێ وە ڕەنگ دەداتەوە لە نێو ئەدەب و هونەر و تەلارسازی و...هتد دا .

بۆنموونە : نموونەی شارستانیێتی ئیغریقی و چینی و ئیسلامی بەشێوەیەكی زۆر ڕون وئاشكرا جیاوازە لە هونەرەكانی و ئاداب وسلوك وهەڵسوكەوتی خەڵكەكەی دا جا ئەگەر ئەوە روون ئاشكرا و تێگەیشتو و وەرگیراو بوو ئەوا پێویستە ئاگاداری ئەوەبین كە تێگەیشتن وچمكی رووتی شارستانیێتی ئیستیعابی زۆر فراوانە و ناتوانرێت بۆنموونە وەك كارگەیەكی لە قتونانی كلتوری تەماشا بكرێت .

نموونەی تەنها یەك شارستانیێتی چەندین ڕەنگدانەوە ی جیاواز بەرهەم دێنێ ، بۆنموونە : سۆفنیزم و فەقیهی یاسایی لە نێو ژینگە و كەشە هەوایەكی یەك شارستانیێتیدا گەشەیان كردووە و هەروەها رواقیە و نەفعیەش لە ژینگە وكەش هەوایەكی شارتانیێتی جودادا گەشەیان كردووە ، واتە دەتوانین بڵێین كە بە جیاكردنەوەی نموونەیەكی شارستانیێتی رێگری نیە لەبەردەم بوونی هەمەرەنگیدا ( هەرچەندەش هەندێجار لە نێوان شێوازەكانی دوورن ) ، جا ئەگەر هاتو خودی ئەم هەمەرەنگییەش روكەش بكرێت بە رووكەشی درێژەوە بوو لە تایبەتمەندێتیە شارستانیتەكانیش .

وە بە دەسپێكێك لەم تێبینیەوە من ئاماژە دەدەم بە شێ ئیشكالیەتی مەنهەجی لە میتۆدی چمكی ( پێكدادانی شارستانیەتیەكان )) : یەكەمیان بریتی یە لە بێئاگاییەكی تەواوەتی لە فەرهەنگی ناوخۆیی لەنێو هەموو شارستانیێتیەكدا ، وە دووەمیان بریتیە لە سنگ فراوانی چمكی شارستانیێتی و شمولیەتی بەشێوەیەك كە پشت گوێخستنی تەواوەتی لێك پیتاندنی ( ئاوێتە بوون ) لە نێوان شارستانیێتیەكاندا تیایدا بەهیچ جۆرێك دروست نییە وناگونجێ ، وە سێیەمیان بریتیە لە وەی كەمن لەم نووسینەمدا مەبەستمە كە ئەویش بریتیە لە بەكارهێنانی ئەم چمك وتێگەیشتنە شیكاریەیەبۆشرۆڤەكردنی دیاردە لە سەر ئاستێكی تردا ، وەلێرەدا پێویستی زیاتر درێژەی پێبدرێت و باسێكی تێر وتێسەلی لێوە بكرێت .

بۆهەر تێگەیشتن و چمكێكی شیكاریانەی بازنەیەك یان هەر بوارێكی تر دروست وگونجاوە كە ئەو شرۆڤەكردنە تێیدا بەكار بهێنیت ، وە دروست وگونجاو نییە ئەو دەرئەنجامە پەیوەندارانەی كە چەند كاروبارێكی پەیوەندار بە دیاردەیەكی ترەوە لە بوارێكی تردا بگشتێنیت بەسەریدا .




فکری
سروەت

وە بۆنموونە ئەگەر چەمکێکمان پەرەپێدا دەربارەی چۆنێتی بڵاوبونەوەی میکرۆب و زیادبوونی و زۆر بوونی لە خوێندا ئەوا هەرگیز گونجاو و دروست نییە کە ئەو چەمکە بەکار بهێنین لە بڵاوبونەوەی ئەو میکرۆبە لە نێو خانەوادەی ئەو نەخۆشەدا کەتوشبووە ، واتە ئەگەر چەمك و تێگەیشتنێك بۆ شرۆڤەکردنی ململانێ نێتنییەکان گشەی سەند ئەوا هەرگیز دروست نییە ئەوە بەکار بهێنرێت لە خیلافە خێزانیەکاندا ، وە ئەگەر کەمێك لێکچونمان نواند لە نێوان ئەم دووباسەدا ئەوا دادەنرێت بە لێك چواندنێکی سەرپێیی کە راست نابێتەوە بە شرۆڤەرکردنێکی زانستیانە وە ئەگەر بشتوانرێت ئەو لێك چواندنەش وەك نموونەیەکی مەجازر بهێنرێتەوە بۆ لێك نزیکردنەوەی تێگەیشتن لەو باسە .

وە لەسەر ئەمەوە دەگونجێ کە چەمك وتێگەیشتنی لێکچوو ی شارستانێتی تەرح بکرێت وەك شرۆڤەکردنێك بۆ ئاراستەکردنە کلتوورییەکان یان ئەمەتە سیاسی وئابوورییە گشتییەکان ، بەڵام دووبارە ناگونجێت کە بەکار بهێنرێت لە شرۆڤەکردنی چالاکیەکان و رووداوە زانستی وسیاسی و ئابوورییەکان و ... هتد ، بەڵام دەتوانرێت بەدوادا چوون بکرێت لە نێوان دوو نموونەی شارستانێتی لە هەر بوارێکدا بۆ توێژینەوە کردن لەسەر ئەو رەهەندانەی کە دە چێتە نێو حسابی هەریەکێکیانەوە و توندێتی چرکردنەوە لەسەر ئەو رەهەندانە .

وە کاتێك دوونموونەی شارستانێتی لەسەر یەك شانۆی مێژوویدا بەیەك دەگەن ئەوەی کە بە کرداری رووەدات بریتی نییە لە لێك هەڵهاتن و ئاوابوون لەیەکتری بەڵکو بریتی یە لە ئاوێتە بوون لێك پێتاندن و کاریگەر لەسەر یەکتر کردن بەشێوە یەکی خاو وە لەگەڵ کەمێك لێك هەڵهاتن و وون بوون لەیەکتر .

پوختەی ئەمە بریتییە لە : ئەوەی کە بەشێوەیەکی مەنهەجی ناگونجێ و دروست نییە بریتییە لە بەکارهێنانی چەمك و تێگەیشتنی شارستانێتی بۆ شرۆڤەکردنی ململانێیە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان وە ئەمەش کاریگەری کردۆتە سەر بەرێوە بردنی ململانێیەکە ، کە ئەگەر وەسفیشکرا بە حەتمیەت ، وە نەگونجاندنی شارستانێتی ئاماژە دەدات بە شەمەوەتی ململانێیکە و هانابردن بۆ زیاتر لە هۆکارێك کە پێی بگات وکۆنتراکتی لەگەڵدا بکات .

ئەوەش شاراوە نییە کە ریتمی ململانێی شارستانێتی هەندێ جار کەسانی سیاسی سەر سوورمان دەکات وەلایانەوە شتێکی جوانە چونکە پاساودانێکی ئەخلاقی بۆ کردارە ناشازەکانیان دەبەخشێ ، هەروەها ئاماژە دەرێت بەوەی کە زۆربەی ئەدەبیاتی بزوتنەوە ئیسلامیەکان دەکەونە نێو ئەم تەڵە مەنهەجییەوە مێژوو بە تەرحێکی تر تەرح دەکەن هەروەکو چۆن غەیری ئەوانیش وایان کردووە .

٠٠ لەم نووسینەمدا دەمەوێت چارسەری کێشەی خراپ تێگەیشتنی رۆشنبیری لە نێوان رۆشنبیریەتی رۆژئاوا و رۆشنبیریەتی ئیسلامی بکەم ، لەگەڵ پێزانینێکی تەواوێتیم بە فرە جۆری و رەگەزییەکی زۆر کە لە هەر دووکیاندا هەیە ، وە بە تایبەتی کلتور ورۆشنبیریەتی ئەمریکی دەخەمە روو بەو هەوڵەی کە بتوانم کە چۆن خودی خۆی دەبینێ ئاوا دەستنیشانی بەهاکەی بکەم ،ئەمەش لە بابی پروپاگەندە وە نییە بۆ ئەوەی کە پێویستی بە زیاتر پروپاگەندە نییە بەڵکو لە رووی دەروازەیەکی مەنهەجییەوە یە کە دەیەوێت بڕوانێتە کلتوری ئەمریکی لە ناوەوەیدا وە تێبگات لە تاکەکانی بەهاکان لە چوارچێوەی دامەزراوەێتی خۆیدا بە بێ ئەوەی پێشەکی رێژەکانی لە دەرەوەدا بێم و بچمە ناوەوەی ، هەربۆیە من لێرەدا پشت ئەبەستم بە شرۆڤەکردنی بەها کۆمەڵایەتیە ئەمریکیەکان بۆ یارمەتیدان لەسەر تێگەیشتن لە دامەزراوەیی کلتوریان بەبێ هەوڵدانی هەڵسەنگاندن یان جێبەجێکردن

وە ئەگەر موسوڵمان وا هەست بکا کە رۆژئاوا خراپ لە خۆی و بەهاکەی تێ گەیشتووە ئەوا ئەو هەستە بەشێوەکی جوزئی بنەمایە لەسەر تێگەیشتنی رۆژئاوا بۆخودی خۆی و خەیاڵی لە بارەی خودی خۆیەوە ، واتە : تێگەیشتن لە پێکهاتە بەهاییە ئەمریکیەکان و چۆن دەپرژێتە نێو هزر وهۆش و دەروونی ئەهلی خۆیەوە یارمەتیدەرێکە بۆ تێگەیشتنی عەجزیان لە تێگەیشتنی گەلانی تری جیهان .

وە من لێرەدا پشت دەبەستم بەو ریزبە ندیەی بەهائەمریکیەکان کە ( ویلسۆن ) لەساڵی ١٩٧٠ دا خستوێتیە بەردەست و ئەوەی کە بەردەوام بەکار دەهێنرێت وەك بابەتێکی تەدریسی ،، وە من جەخت دەکەمەوە لەسەر ئارەزووم لە سەلماندنی رای



بەرامبەر ، وە لەسەرەتاوە ئاگایی دەهێنمەوە کە دەروازەی بەهاکان ناتوانێت هەموو شتێك لە ژیانی کۆمەڵگاکان شرۆڤە بکات ، وە بەڵکو ناشتوانێت شرۆڤەی هەر دیاردەیەك بەتەواوەتی بکات ، وە هەموو ئەوەی کە پێشکەشی دەکات بریتییە لە وەسفێکی بێ بۆچوون ئاراستەی جیهان ( وێنەی وەکو وێنەی تێگەیشتن وچەمکی شارستانێتی ) وە چۆن کاروبارەکان ڕووکەش دەکات وەدەیگونجێنێ ، هەروەها لەسەر هەموو یەکێك لەتاکەکانی کۆمەڵگاش جێبەجێ نابێت ، هەروەها ئاگایی دەدەم بەوەی کە زۆرێك لە لێك جودایی هەیە لەنێوان ئەو بەهایانەی کە خودی هەر کۆمەڵگایەك بانگەشەی بۆ دەکات ، وە ئەم تایبەتمەندێتییە رۆشنبیرییە ڕەنگ دەداتەوە لە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم لێك جوداییانەدا .

فەردیەت وئازادی دوو خەسڵەتن کە تاکی ئەمریکی پێ جیا دەکرێتەوە وە دادەنرێت بە سیمایەکی سەرەکی لە قەوارەی کۆمەڵایەتییان و وە سروشتێتییان بە هەڵهاتنیان لە هەموو کوتو بەندێك ئاسراون ، وە وێنەی کیشوەری گەورە ( ئەمریکا ) کە ماوە دەرەخسێنێ بۆ هەموو تاکێك کە چی دەوێت دەتوانێت بیکات بەو مەرجەی کە زیادە ڕەوی نەکاتە سەر کەسی بەرامبەرەکەی ، جا ئەم خەسڵەتە لە نێو بەهاکانیاندا بەرجەستە بووە جا لەهەر بوارو ئاستێکدا بێت .

وە واباشە کە شوێن ڕەنگدانەوەی ئەم بەهایانە بکەوین لە هەر دووبواری گشتی کە پەیوەندارە بە روانین بەرەو ڕۆڵی حکومەت لە ژیانی گشتیدا وە ئەوی تریان بواری تایبەتی کە پەیوانداره بە بە داب ونەریتە خێزانیەکان .

وە زانراوە کە هاوڵاتی ئەمریکی زۆرێك لە دوودڵی لە بەرامبەر حکومەتەکەیدا و هەیەو بەردەوام ڕاوی دەنێت ، وە ئارەزوو دەکات بەلای پوختکردنی کارو بارەکانیان بەبێ دەست تێوەردانێك لەلایەن ( مامە سام ) ەوە ، جا ئەم ئارەزوو وەیلە دروست کردن و پێکهێنانی چەندین کۆمەڵەی ناقازانجی لێکەوتوتەوەکە سانانییە هیچ مرۆڤێك بێت بەخەیاڵیدا لە چالاکی یان ئارەزوو یان گرنگی پێدان وە ئەم کۆمەڵانەش کۆمەڵەیەك نین کە کۆمەڵێك لە ئارەزوومەندان لەخۆبگرێ ، وە ئەمەش تەنها کورت ناکرێتەوە لەسەر ئارەزووە تاکی یەکان و گرنگی پێدانە کۆمەڵایەتیەکان بەڵکو تێدەپەڕێت بۆ ئەو کێشە وباسە مەزنە سیاسی یان ئابووری یان زانستیەکان کە وادەکات ئەم کۆمەڵانە خۆیان وەك کەرت وپارچەیەکی پێویست بۆ دانانی سنورێك بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت و دەست تێوەردانەکانی لە کارو باری هاوڵاتیاندا ببیننەوە .

بەلام دەسەلات بۆ خودی خۆی هەوڵ دەدات نفوزی خۆی درێژبکاتەوە وە دەسەڵاتەکانی خۆی بەریدات بەهەموو لایەکدا ، بەڵام خۆی وا دەبینێتەوە کە پێویستی بەو کۆمەڵە نا قازانجیانەیە .

وە ئەوەی کە ڕوودەدات کە چڕکردنەوەی ئەو کۆمەڵانەیە لەسەر گرنگییە تایبەتییەکانە کە شارەزایی و مەعریفەیەکی تەکنیکی پێشکەوتووی زۆر ئاست بەرزی پێ بەخشیوە کە حکومەت ناتوانێ دەست بەرداریان بێت .

ئەم کۆمەڵانەش لە پەیوەندییە ئاڵوگۆڕەکانیدا لەگەڵ حکومەتدا بەش بوونە بۆ دوو بەشەوە : بەشی یەکەم پەیوەندارە بە ئەو ئارەزوو و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتیانەی کە پەیوەندیەکانی لەگەڵ حکومەتدا دیاری دەکات کە ئەویش چاوپۆشیان بکات لە باجەکان لە بەرامبەر ئەو خزمەتگوزارییانەی کە پێی هەڵدەستێت کە دەبێتە هۆی لابردن وکەم کردنەوەی ئەو ئەرك وبارانەی کە کەوتوتە سەر ئەستۆی حکومەت یان تەبریرێکە بۆ زیادەڕۆییەکانی کە حکومەت پێی هەڵدەسایت لەم خزمەتگوزاریانەدا ، وە ئەمەش بوتەهۆی یارمەتی دانێکی ئەم کۆمەڵانە لە ئیستیعابکردن و وەهەزمکردنی هەستە مرۆیی یەکان ( دینی یان عیلمانی ) چەندین کۆمەڵە و ڕێکخراوی خێرخوازی دامەزراوە بۆ کۆمەکی کردن ودەستگیرۆیی کردنی هەژاران ولێ قەوماوان لە کاتی قوتاغە شکستییە ئابوورییەکاندا وەك ڕێکخراوی ( سوپای ڕزگارکردن Salavation Army ) یان دامەزراوە تەرفیهی و وەرزشی یەکان وەك دامەزراوەی بەناوبانگی ( YMCA ) ئەمەش بەمەبەستی کەمکردنەوەی ئارەحتی و ناهەمواری شارەکان لەسەر کۆچکەرانی لادێکان ودەروەی ئەمریکا . وە دەتوانین وا بڕوانینە ئەم هەولانە کە بریتیین لە جۆرێك لە پێویستییەکی ئانی بۆ ڕەهەندە ئەخلاقیەکان




کە بەمە حکومەت وا پێشبینی دەکات کە بجولێتەوە بەپێی رەهەندە بەرژەوەندیە رووتەکان لە بەرامبەر تایبەتمەندکردنی ئەو کۆمەڵانە بە پێشکەشکردنی ( خزمەتگوزارییە ئەخلاقیەکان ) .

وە حکومەت ناو بەناو داوادەکات لە و کۆمەڵانە کە هەندێ چاکسازی بکەن ، بەڵام زوربەیان بەرەبەرەکانێیەکی مەترسی دروست ناکەنە سەر حکومەت جگە لەوانەی کە تەبەنای فەلسەفە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکان دەکەن .

بەڵام بەشەکەی تری ئەو کۆمەڵە ودامەزراوانە بریتین لە دامەزراوەی پیشەیی کە گرنگی دەدات بە بوار و باسە هونەرییەکان و کە پەیوەندیەکی هەمەچەشنەی لەگەڵ حکومەتدا دروست کردووە ، هەروەها تەنها سودمەندیش نەبووە بەو لێخۆش وبوون وچاوپۆشی کردنەی حکومەت لە باجدا بەڵکو حکومەت هەندێجار کۆمەکی و منحەی پێدەدات ئەو یش بۆ هەڵسانی بە ئەنجامدانی چەند توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیەك .

وە ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەڵە و رێکخراوی زانستی لەبوارەکانی پزیشکی و ئەندازیاری و ژینگە و فیزیا و وە زۆرێك لە دامەزراوی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە سیاسی و نابوورییەکان چوونەتە ژێر سێبەری ئەم بەشەیانەوە کە وای لێ هاتووە دانراوە بە ( خزانات الفکریە – Think Tank ) .

وە پوختەی ئەمە ئەوەیە کە ئەو پەیوەندیەی لەنێوان ئەم کۆمەڵە رێکخراوانە ودەسەڵاتدا هەیە پەرەی سەندووە بۆ پەیوەندیەکی هارمۆتی ، ئاڵوگۆڕ کە رەنگی داوەتەو لە سەر ئاستی فەردی لە جەختکردنەوەی هەستی تاك و مومارەسەکردنی ئازادی جولەی لە بارودۆخێکدا کە ماوەی بۆ برەخسێنێ کە تەبەنای ئەو بیرە بکات کە خۆی پێی خۆشە وە بەرگریشی لێبکات وە ماوەشی بو بەرەلابکرێت بۆ بوون و دەربڕین لەسەر ئاستێکی گشتی جائیتر تایبەتمەندێتی یەکەی هەر چۆنێك بێت.

وە لە سەر ئاستی کۆمەڵگەیش خودی حکومەت وای لێهاتووە کە پشت ببەستێت بەو کۆمەڵە ورێکخراوانە بۆ پەرەپێدانی چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە روبەرووی دەبێتەوە ، وە ئەمە دادەنرێت بە گرنگترین سەرچاوەیەکی گونجاو بۆ رێکخستنی ژیانی ئەمریکیەکان کە ژیانێکی نەرم و مرونە و جیاوازی بەخشیوەتە رەوگەی ژیانیان ،لێرەدا من نمونەیەك دێنمەوە وەك : ( رێکخراوی ئاتانزاجی یانەی ئوتۆمبێل ) ی ئەمریکی کە ناسراوە بە ( AAA ) وە ئەرکی سەرەکی بریتییە( لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریە زانیاری وزانستیەکانە بە گەشتیاران ، کە بیمەی ( ضمان ) تیادایە لە کاتی هەر رووداوێکیشدا ) کە دەسەڵاتی هەیە تابلۆی ژمارەی ئوتۆمبێلەکان نوێ بکاتەوە کە ئەمە خۆی دامەزراوەیەکی حکومی ئەم کارە دەکات ، وە وێنەی ئەم جۆرە هارمۆتی یە لەنێوان کەرتی مەدەنی و حکومیدا زۆر نامۆیە لەوجۆرە لە ولاتێکی تردا ، کە لەوانەشە ئەم جۆرە سلوك وکارانە تەنها ئەمریکا تەفەرودی پێکردبێت . ئەمەی کە باسمانکرد باسێکی کورت بوو کە پەیوەندار بوو بە ژیانی گشتی یەوە بوو جا پشت بەخوا لەژمارەی داهاتوومانددا دێمە سەرباسی ژیانی تایبەتی کۆمەڵگەی ئەمریکی کە ئەویان پێم وایە باسێکی زۆتر لەمە زیاترە و لەمە زیاتر هەڵدەگرێت کەلەسەری بدوێم و روونی بکەمەوە بۆ یە پێم باش بوو هەڵی بگرم بۆ بەشێکی تر کە لە ژمارەی داهاتوودا باسی لێوە دەکەم .






# خوێندنەوەیەکی موزایکی قەیرانی دار فور

## ئاسوی چارەسەری ئاشتیانەی سیاسی

سەرنووسەر

- دوولایەن یان چەند لایەنێك
- تێکردنی کارتەکان و گرانیچارەسەر
- چارەنوسێکی پڕ لەمەترسی

لە ئاشکراترین رووی هەوڵەکانی ڕێگە چارەی سیاسی قـەیرانی دارفـور تەبـەنا دەکرێت لە سەر دانووسـتانەکان وڕێکـەوتن نامەکان لەلایەن حکومـەتی خـەرتوم وهـەر دووئـەو گروپـەی کـە چـەکیان هەڵگرتووە کە ئەوانیش " بزوتنـەوەی دادپەروەری و یەکسـانی و بزوتنـەوەی رزگاریخوزای سودان " نن .

لەکـاتێکدا هـێزە سیاسـیەکان دوور دەخرێنەوە وە جا ئیتر چ لە سـەر ئاستی چـوار چێـوەی دارفـور یـان سودان دا بێت .

### دوولایەن یان چەند لایەنێك

سەرەڕای گرنگـیدان بەهـەر دووگروپـە ناوبراوەکـە لـە پێدانـی قورسایییەکی دانوستان و نوێنەرایەتیەکان ئـەوا هـەردوکیان نوێنەرایـەتی جەسـتەی گەورەی دارفوری گەورە ناکەن لە مـەیداندا ، ئـەو دارفـورەی کـە ڕووبـەرە جوگرافیایییەکەی یەکسانە بە ڕووبەری فەرەنسا و کەمێك لەو زیاتریش .

بزوتنـەوەی دادپـەروەری و یەکسـانی لـە نێو سەرکردەکانیدا چـەند جولاڕێکی کەم ئـەزموونی تیایدایـە کـە ئـەزموونیان بەئەندازەیـەکی پێویسـت نییـە کـە نوێنەرایـەتی گروپێکـی ( ئیسـلامی ) دەکـەن کـە بـاڵێکن ولەحکومـەتی خـەرتوم جیـا بونەتـەوە لـە کـاتێکدا کـە بزوتنـەوەی



ڕزگـاریخوازی سـودان بـە شـێوەیەك بێـت لەشێوەکان پەیوەستە بـە بزوتنـەوی میللی بـۆ رزگـارکردنی سـودان ( SLAP ) بەسەرکردایەتی ( جون گارانگ ) .

ئەوەی جێگەی سەرنج راکێشان بێت ئەوەیـە کـە هـەردوو بزوتنەوەکـە بـە هاوشێوە و لێك چوی یەکتر حسـابیان بـۆ دەکرێـت ئەمـەش بـەو پێیـەی کـە هـەردووکیان دەر بـڕی یـەك بـاڵن و وە ئەوەش بەهەڵە و ناهەقی دەزانن کە ناویان لێ نراوە خێڵ و هۆز وتیرە ئەفریقی یەکان ( العرب و الرزقه ) .

ئامـاژە لـێرەدا بـۆ ناسـانایی جێبـەجێکردنی ئـەو ڕێکەوتنانەیـە کـە لـەنێوان حکومـەت وهـەردوو گروپەکـەدا ئـەنجام دەدرێـت کـە هـەوڵ دەدەن کـە شـەڕ بوەسـتێت وچـەك دامـاڵردرێت ، ئەمـەش چونکە لە دیفاکتۆدا لـە دارفـۆردا چـەندین تاقم و گـروپ و ئاراسـتە و هـێزی سیاسی هەن کە ناتوانرێن بخرێنە پەراوێزەوە و پشت گوێ بخرێـن کـە ناشـتوانرێت ئاراسـتەی زوریەشـیان بخرێنـە پـاڵ ئـەو دووهـێزە سەرەکییە ، سەرەڕای ئەوەی کـە هـەردوو گروپـی سـەربازی بۆیـەك گوتـار دەدوێن کە جێگەی دەنگی خۆیـان لـە دارفـۆردا کردوێتەوە بەڵام بەتـەواوەتی دوورە لەهـەر کۆمـەکی و یارمەتی دانی زوربەی تیرە و هۆز وخێڵـە ( عـەرەبی ) شـوانکار وجوتیارەکـان لەبەرامبـەر ئـەو تـیرە وخێڵانـەی کـە ئێسـتا رەگـەزیان دەدرێتـە پـاڵ رەچەڵـەکی ئەفریقییەوە . ئەمـە کـارێکی ناسانایە کـە ویژدانـی سـودانی قبوڵـی دابەشکردنێکی لەو جۆرە بکـات ،، ئـەوەی کـە لـێرەدا مەبەسـتمانە و هـەروەها لایەنەکانی

ململانێکەش لای مەبەستێتی بریتی‌یە لە : یەکەمیان : کۆمەڵە وگروپەکانە کە ئەمانە دەگرێتەوە ( الزيادية،كواهلة ، بني هلبة ، الرزيقات الهبانية ) وە دووەمیان : ئەمانە دەگرێتە خۆی ( الفور ، المساليت ، الزغاوة ، البرتي ، البرقد )جا لە راستیدا بۆ خوشبەختی ململانێی ئەم تیرە و هۆزانە لە سەر بنەمای ئەم دابەشکردنە نیە بەڵکو مل ملانێ دەبینین کە دەگوزەرێت لە نێوان هۆزەکانی یەک کۆمەڵەیانادا .

ئەوەی کە قەیرانی هەرەس هێنانی ئەو هەولانەی رێگە چارەی ئاشتیانەی لە رێگەی چەند دانوستانێکی لاوەکی حکومی لەگەڵ چەکدارەکان زیاتر کرد سروشتی سەرکردە سیاسی یەکانە لە ناو حکومەت وحیزبدا کە دەتوانرێت بوترێت ئینتیمایان بۆ لایەنەکانی مل ملانێیەکە کارەکای خستوتە قوتاغێکی قەیراناوی ترەوە ، لەلایەکی ترەوە هەندێ لایەنی دارفوڕ پێیان وایە کە ئەو سەرکردە سیاسی‌یانەی دارفور کە لە ناو هەیکەلی دەسەلاتی حکومەتدان زوربەیان لایەنی تەرەفەکەی تری مل ملانێیەکەن هاوکاتیش سەرکردە سیاسی‌یەکانی ناو هەیکەلی سیاسی دەولەتی ئیتحادی یان فیدرالی پێیان وایە کە حکومەت لە خاکی دارفوڕدا خۆی بەهێز کردووە بە چەند هاوپەیمانیەتێکی مەیدانی چەکداری لایەنەکەی تری مل ملانێیەکە ، ئەمەش شروڤەی ئەو لەکار لابردنی یەکەم لێپرساوی رامیاری لە کوتگرەی نیشتمانی دەسەلاتدار وە گوڕینی بەیەکێکی تر لە باکور لەگەڵ زیاد بوونی قەیرانی دارفوڕدا .

## تێکردنی کارتەکان و گرانی چارەسەر

تێرموٚمیتەری سیاسی نێوان حکومەتی خەرتوم و ئەنجمینا رۆلی بینیوە لە هەرەس پێهێنانی دانوستانەکانی ( ئابشی و ئەنجمینا ) کە تێیدا دەولەتی ( تشاد ) دەست تێوەردانی راستەو خۆ و ناراستەو خۆی هەبووە لە قەیرانی دارفوردا ئەم دەست تێوەر دانەش لە رێگە هاوپەیمانێتی لەگەڵ بەشە سنوری‌یە خێلەکی‌یەیدا کە دەتوانرێت بەردەوام گەشەی پێدرێت و بەرەو پێشەوە ببرێت ئەم بەرەو پێش بردنەش تەنها بەهوی ئەو لێک نزیک بوونەوە ئێتنی‌یە نی‌یە بەڵکو بەهوی لێک چوونی شێوە وهارموٚنیەتی گوزەرانی خەلکەکەشیەوە ، کە گوزەران و ژیانی دەشتەکی زیاتر نزیکە لەوەی کە بگونجێ لەگەڵ هاوشێوەکانی خۆیدا ، هەروەها حالیش لە بەرامبەردا واىوە سەبارەت بە کۆمەڵەکەی ترەوە کە ئەوان لەسەر کشتیاری دەژین .

هەرەس هێنانی ئەم دانوستانانە ئەنجام درا بە شکست پێهێنانی لەسەر زەویدا بەهوی ئەوەی کە سروشتێتی بوونی سەربازی ئۆپوزسیۆن بنەمایە لەسەر شێوازی جەنگی پارتیزانی و لە سەر رێگەی کۆمەکی هێزە سەربازی یەکاندا لێیان دەدەن وپاشان دەگەرێنەوە بوتاو خەلکە سڤیلەکان هەر ئەمەشە وا دەکات لە حکومەت ناچار بێت رێگەی بۆردومان کردنی ناوچەکان بکات لە رێگەی هێزە هەوایی‌یەکانیانەوە وە بوونی ئەو هێز و ئەم هێز بەلابکاتەوە بە سەر زەویدا .

وە ئەوەشی کە بووە هوی زیاتر ئالوزکردنی ئاستەنگەکانی گەیشتن بە رێگە چارەیەکی ئاشتیانەی سەرتاسەری قەیرانەکە تەنها بریتی نەبووە لە هاوکاتی پەرەسەندنی قەیرانەکە لەگەڵ ئیمزاکردنی رێکەوتنامەکانی ئاشتی سەرتاسەری لەنێوان حکومەتی خەرتوم و بزوتنەوەی میللی‌دا بەڵکو زیاتر ئالوز کردنە لە دەست تێوەردانی سروشتێتی ململانێیەکە بە دەنگوەهاتنەکانی حکومەت بۆ مامەڵەکردنی لە گەڵ چەک هەڵگران بەشێوەیەکی دووانی لەپەراوێز کردنی کۆمەڵگەی سیاسی سودانیدا وە ئەوەی کە دەتوانرێت باس بکرێت لە دەسکەوت و سەرکەوتنەکانی کە بزوتنەوەی میللی بەدەستی هێنابێت بریتی بوو لە وەرگرتنی بەش لە بەرو بووم وداهات و دەسەلات بۆ داواکاری دارفوڕییەکان ، وە ئاست بەرزبوونەوەی ئالیەتی بەدەوڵەتکردن کە لە کێشەی دارفوڕدا باسەکە گەیشتوتە ئەوپەری کە هەرگیز کێشەی باشوری سودان نەگەیوەتە ئەو ئاستەی کە ئێستا کێشەی دارفوڕی گەیشتوتێ ، وە بۆنموونەش بوئەمە ( غیارد گالوشی )ی هەڵسوڕێنەری کاروبارەکانی ئەمریکا لە خەرتوم و ( کنت دیگر ) ی بالوێزی یەکێتی ئەوروپا دەڵێن ناو بەناو تێپەراندن هەیە بەسەر صەلاحیاتی ئەو لیژنەیەی کە حکومەت پێکی‌هێناوە بۆ چاودێری کردنی هەر خروقات وپێشێلکردنێکی مافەکانی مروڤ وە داواکاریشن کە ژمارەی هێزەکانی پاراستنی چاودێران زیاد بکرێت ، وە گالوشی بە ئاشکرا داوای لەحکومەتی

خەرتوم کردووە کە چی تر هێزی هەوایی بەکار نەهێنێت لە بۆردومانکردنی خەڵکی سڤیلدا .

جا لەسەر ئەم ئاستەوە حکومەتی خەرتوم چوتە نا وململانێی لێک جوداییەکەوە لە گۆشە دیدگایانەوە لەگەڵ یەکێتی ئەفریقاوە کە پاڵی پێوە داوەتەوە وەك ئەلتەر ناتیڤێکی بونی هەر هێزێکی رۆژئاوای تری دەزانێت ، ئەمەش لەکاتێکدا یە کە لێپرساوێکی یەکێتی ئەفریقا باسی کردوە لە پێویستیتی ناردنی هێزی سەربازی بۆ پارێزگاری کردنی چاودێران ، وە ئەوەی جێگەی یەکەم جیاوازی بێت ئەوەیە کە یەکەم هێز کە دەگاتە دارفور بریتی یە لە ( ۱۵۰ ) سەربازی رواندی ! هەروەها نێجیریا هاتوتە سەر ئەوەی کە باس بکات لە هێزی نێجیری کە رەوانەی هەرێمی دارفور بکرێت کە ژمارەیان بگاتە ( ۱۵۰۰ ) سەرباز .

## چارەنوسێکی پڕ لەمەترسی

ماوەی زەمەنی ( ماوەی ۳۰ رۆژ ) کە نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری لەسەر داوە بۆ راوپۆرتی سکتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ( کوفی ئەنان ) بەراورد کراوە بە بار ودۆخی ئەمنی لەسەر زەویدا و باروودۆخی مرۆیی لە ئۆردوگا و گرتنگاکاندا لە هەرێمەکەدا ، وە لەسەرەتای چارەسەری سیاسیدا ئالۆزی یەکی تر زیادی کرد بۆسەر چوتیەتی دانووستانەکانی پێشوو لەگەڵ یاخی بواندا و چارپێکەوتنە نوێیە پێشنیار کراوەکان لە ئەبوجادا ، لەدوای ئەوە کە حکومەت هەوڵی دا کە دانوستانەکان راپێچی ئەدیس ئەبابا بکات تاکو لەژێر چەتری یەکێتی ئەفریقادا بیهێڵێتەوە ، وەحکومەتی خەرتوم هەوڵێکی زۆری دا بۆ کار کردن لە خاکی دارفوردا .

وە دیارترین ئەو هەولانەی کە هەوڵی بۆداوە پێی بگات لە ئێستایدا قسەکردنێتی لەسەر دانانی ( ۱۲ ) خاڵی ئەمنی ( لەدواکاریەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانە ) لە خاکی دارفوردا وە ئامادەکردنی ( ۱۲ ) خاڵی پۆلیسی و زیادکردنی ( ۲۰۰۰ پۆلیس و ۱۰۰ ئوتومبیلی جۆری لاند کروزر ) بۆ ئەوەی ژمارەی پۆلیس لەو هەرێمەدا بگاتە ( ۶۰۰۰ ) و زامن کردنی سەربازگاکان لەسنوری ( ۲۰ کم ) دا ، ئەمە لەکاتێکدا روودەدات کە ( برونك ) ی نێردراوی نەتەوەیەکگرتووەکان داوای ناردنی هەزارەها چاودێر وسەرباز دەکات بۆ هەرێمەکە ، وە حکومەتیش هەوڵی ئەوە دەدات کە قەرەبووی هەر بیۆکەیەك بکاتەوە سەبارەت بەناردنی هەر هێزێکی ئاشتی پارێزی نێونەتەوەیی بە پۆلیسی سودانی ؛ وەتەنها هەبوونی بێگانە لەو هەرێمەدا تەنها لە سەر بوونی چاودێران بوەستێتەوە ، بەڵام نێجیریا کە ئێستا سەرۆکایەتی لیژنەیەکی نێردراوی سەربازی ئەفریقی دەکات بۆ ئەو هەرێمە زیاتر لە بیر وراو بۆچوونەکانی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە بۆ قەیرانەکە هەڵوێست و رای نزیکترە .

( گالوشی ) بەرۆژنامە سودانیەکانی راگەیاندووە کە پتر لە یەك ملیۆن و دووسەد هەزار کەس ئاوارە بوون لە هەرێمەکەدا ، وە باس لەو دەست درێژی یە سێکسیانەش کردکە دەرهەق بەئافرەتان ئەنجام دەدرێت ، بەڵام حکوموتی سودان ئەو تۆمەتەی رەت کردوە وە گالوشی ئەوەشی روت کە ئایا لیژنەکان لەوێ چی دەکەن ؟

لەم نێوەندەدا ئاژانسەکانی هەواڵ باس لەوە دەکەن کە حکومەتی سودان ( ۱۲ ) فرۆکەی جۆری ( میگ ) ی لە روسیا کڕیوە وە روسیاش ئەوەی رەت کردەوە کە گوایە ئەم صەفقەیە هیچ پەیوەندیەکی نییە بە قەیرانی دارفورەوە وە ( ئەندریە دینیسوف ) ئەوەی روون کردەوە کە ئەنجومەنی ئاسایش هەناردەکردن وکڕینی چەك وچەڵی سەربازی لەسەر سودان قەدەغە نەکردووە وە ئەمەش وەك رەتدانەوەیەکی روسیا بوو لە سەر ئەو توانج ورەخنانەی کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئاراستەی روسیای کردبوو .

کێشەیەکی تر کە لە دانوستانەکاندا لەگەڵ چەکدارەکاندا و لە ئالوگۆڕکردنەکاندا هەیە لەگەڵ ئەمریکا ویەکێتی ئەوروپادا بریتییە لە دروست بوونی چەند پێناسەیەك بۆ ( جەنجەوید ) ئەوەی کە نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیاری لەسەر داوە وە حکومەتی سودانیش رەزامەندی لەسەر پێشانداوە ئەوەیەکە لەچەك دابماڵدرێن چونکە میلیشیایەکی نایاسایی لەیاسا دەرچوون .

وە حکومەت دەڵێت ( جەنجەوید ) بریتین لەکۆمەڵێ چەتە و دز و رێگر و لەیاسا دەرچوو کە پێکهاتوون لە چەند تیرە و خێڵێك ، وە پێناسەیەکی تریان ئەوەیە کە ئەوانە کۆمەڵێکن کە حکومەت پێشتر چەکداری کردوون وەك میلیشیایەکی سەربەخۆی لەجەنگەکانیدالەدژی بەرامبەری شەری پێکردوون وە ئێستاش لەهەوڵی




ئەوەدایــە کــە رایانبکێشــێتەوە نێــو هەیکەلی یاسایی سوپاوە .

وە ئەو تیرە وهۆزو خێڵە عەرەبانـەی کـە پێشـتر شـان بەشـانی حکومــەت جــەنگاون ئێســتا ئــەوە رەت دەکەنەوە کە پێناســە(جەنجەوید) بیانگرێتەوە ..

ئەمەش بارەکەی زیاتر ئـاڵۆز کـرد کـاتێ کەسـەرۆکی ســودان (جەنەراڵ عومەرحەسەن بەشیر ) ئــە لێدوانێکیــدا وتــی کــە دامــاڵینی چــەکی جەنجــەوید کـارێکی پێویسـتە و دەتوانرێــت بەئــەنجام بگەیــەنرێت ، لــەکاتێکدا ( عبدالرحیــم حســین )ی وەزیـــری نــاوخۆ و نوێنــەری ســەرۆکی ســودان لەهــەرێمی دارفــوردا دامــاڵینی چەکی جەنجــەویدی بــەکارێکی مەحاڵ و گـران لەقەڵـەم دا و وە وای چوانـد کە گەر کارێکی لەو جۆرە جێبەجێ بکرێـن ناوچەکــە رووبــەرووی جــەنگێکی ئـــەهلی دەبێتەوە .

بــارر ودۆخ ئێســـتا لـــە دیدگـــای نەتەوەیـەکگرتووەکان و ئـەفریقاو یـــەکێتی ئــەورووپا وە ئامـــاژە دەرە بـــەوەی کـــە بارەدۆخەکـە باشـترە وبـــەرە وباشـــتر دەڕوات لەروی بارودۆخی مرۆیی یەوە نەك لــە رووی بارودۆخی ئەمنی یەوە .

ئاوا دەڵێن لەگەڵ بـەدوور گرتـن وبـەدی کردنی هەر ئاسۆیەکی روون بـۆ چارەسـەری سیاسـیانەی بارودۆخەکـە کـە بـە کــارێکی ئاسـانایی دەزانــن کــە ئــەندازەی بگــرن سەرەرای ئەوەی کە ئەمە مەرجی سـێهەمە لە داواکاریـیەکانی ( کوفی ئەنان ) .




هێشتا بەردەوام گالوشی و کنــت رەتــی ئــەوە دەکەنــەوە کــە هیــچ نیشــانەیەکی راســتەقینەیی نیـیــە بـــۆ گەرانـــەوەی خۆریســـتانەی ئــاوارە ودەرکراوەکــان کـــە حکومەت ئاماژەی پێ دەدات ، بەڵکو باس لەوە دەکەن کەحکومەت بەزۆر دەیانێرێتەوە هاوکات هیچ رێ و شـوێنێکی ئەمنیشـیان بۆدابین نەکردوون .

حکومــەت پێــی وایــە کەلێپرســـراوێتی پاراستنی هاوڵاتیان بریتــی یــە لــە ئــەرکی شەرشــانی خـۆی کــە لــەو بارەیــەوە هیــچ ئامۆژگارییەکی ناوێت بەڵام لەقۆناغی بــە نێودەوڵەتی‌کردنی کێشــەکە وای لێکـردووە کســەیری بریــار و راپۆرتــەکانی ســکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان بکات لەپێش و داوای هەرشرۆڤەکردنێکی تــر ، وەیــەکێتی ئــەورووپا دەڵێت کــە ئــەو هەڵدەستێت بـــە کۆمـــەکی کردنـــی ٥٠٪ ی تێچونـــی تیمەکانی چاودێری کە بەهاکەی دەگاتە ١٢ ملیۆن ئیۆرۆ .

لەکۆتاییدا دەڵێــم چــۆن دەتوانرێــت ئــەم هــــەموو داوایانـــــە کۆبکرێتـــــەوە بـــــۆ بڕیـــــــــاردانێك بەچارەنوسـی چــەندین لایەنــەوە لەماوەیــەکی کـورت وکــەمدا کــە وابکـــــات لـــــەو دانوســـتانانەی کــــە لەگــــەڵ بزوتنــــەوەی دادپــــەروەری و رزگــــاریخوازی ســــودان ببێتەلاوەکی بەشێکی بچوك لــەو ڕێگایــەی کــەدەچێت بــۆ چارســــەری سیاســــیانەی سەرتاسەری کێشەکە .

**سەرچاوەکان**

ماڵپەری کەناڵی ئاسمانی CNN

ماڵپەری الجزیرە نەت

ماڵپەری کەناڵی DW ئەڵمانی

ماڵپەری رۆژنامەی واشنتون پۆست



# ئەڵمانیەکان زیاد بونی دژایەتی کردنی

## ئیسلام دەبەستنەوە

## بە بەرزبوونەوەی تیکڕایی

## تیرۆرەوە



جێگری سەرنووسەر

لەم دواییەدا ڕاپرسییەیە سەرەتاسەریەکان کەپەیمانگای ( الینسباخ ) بۆ توێژینەوەو سەرژمێری یەکان کەکاردەکات بۆ ڕۆژنامەی (فرانکفۆرت الجماینە تسایتونغ ) ئەنجامی دابوو، لە ئەڵمانیادا ئەوەی دەرخست کە چەند بڕیاردانێکی پێش وەخت و دودڵی و گومان لای زۆرینەی هاولاتیانی ئەڵمانیا لەبەرامبەر ئیسلام وکەمینەی موسوڵمانان کە لەو ولاتەدا نیشتەجێن هەیە، ئەمەش لەدەر ئەنجامی ئەو کارە توندو تیژی وتیرۆرستی یانەی کە دەکرێ و دەدرێنە پاڵ ئیسلام و بەناوی ئیسلامەوە دەکرێ لەچەند ولاتێکدا کە خودی ئیسلام لەو جۆرەکارانە زۆر بەدوور و بێبەرییە .

ئەنجامی ڕاپرسییەکە کەلە ١٥ /٩ / ٢٠٠٤ دا بلاو کرایەوە ئەوەی دەرخست کە چەند گۆرانکارییەکی سەرەکی وناوەڕۆکی رووی داوە لە هەڵوێستی چینە جۆر بەجۆرەکانی کۆمەڵگەی ئەڵمانیدا لەبەرامبەر ئیسلام و موسوڵمانان دا بەتایبەتی لەم قۆناغەی تری ڕوداوەکانی قسابخانەکەی قوتابخانەی بیسلان لەکۆماری بیسلانی باکور لە باشوری روسیادا .

ڕێژەی ٦٢٪ ئەوانەی کە ڕایان لێ وەرگیراوە لەدوای ئەو کارە ساتە ڕایان وابوەکە ئەم زەمەنەی ئێستا زەمەنی مل ملانێی شارستانییەتەکانە و هەڵایسانی جەنگێکی قورسە لەنێوان ئیسلام و مەسیحیەت دا لەبەرامبەر ٤٪ یان کە ئەورایەیان پێ وانەبوو .

وە ٦٠٪ لەوانەی کە ڕایان وەرگیراوە دوڵێن کۆمەڵگەی ئەڵمانی بوتە لانەیەکی لەبار و گونجاو بۆ خۆ حەشاردانی تیرۆرستان و ئاسایی ژیانیان و گوزەرانیان لەو ولاتەدا وە ٢٣ ٪ یان دژی ئەم ڕایە بوون .

وە هەواداران پشتیوانانی ئەم ڕایە هۆکاری ئەو خاوبونەوەیە کۆمەڵگەیی یە دەگێڕنەوە بۆ ئەو لیبرالیەی کە هارمۆنی گوزەرانی ناو کۆمەڵگەی ئەڵمانی ئاسان کردووە لە دوای سەردەمانی نازیەتەوە کە ئەمە وای کردووە کە هەل بۆ ئەوانە برەخسێنێ کە چۆن بیانەوێ لەناوەوەدا ئاوابژین .

وەزۆرینەی ئەوانەی کە ڕایان لێ وەرگیراوە سنگ فراوانی و هاوپشتی خۆیان نیشان داوە لە بەرامبەر کەم کردنەوە و بەرتەسککردنەوەی پانتایی ئازادییە گشتی و تاکییەکان لە ئەڵمانیادا و دانانی زیاتر لە چەند ڕێ وشوێنی یاسایی نائاسایی و خۆپارێزی نوێ بۆ ڕووبەڕووبونەوەی تیرۆر لەو ولاتەدا.

٧٩ ٪ بەشدارانی ئەم ڕاپرسییە ئەوەیان روون کردەوە کە ئەوان پشتگیری ناردنەوەی ئەو پەنابەرە بێگانانە دەکەن دەست بەجێ بۆ ولاتەکانی خۆیان لەکاتێکدا کەهەر گومانێك هەبێت لەسەریان سەبارەت بەهەڵسانیان بەهەر کارو چالاکیەك کە کەپەیوەندی هەبێت بە کاری تیرۆرستییەوە ، هەروەها ٧٨٪ ئاواتی ئەوەیان خواست کە چاودێری کردن لەشوێنە گشتی و دامەزراوە فەرمییەکان لەڕێگەی کامێرای ڤیدیۆیی و گشت ئامرازەکانی بیستن وبینینەوە ئەو چاودێرییە چڕتر بکرێتەوە

٥٩٪ داوای ئەوەیان دەکرد کە سوپای ئەڵمانی بەشداری پێبکرێت شان بەشانی هێزەکانی پۆلیس وئاسایش و هەوالگری بۆ توندتر کردنی ئاسایشی گشتی و پاراستنی دامەزراوە گشتی یەکان و خەڵکی و تاکەکانی کۆمەڵگەی ئەڵمانی لە دژی هەر کارێکی ئەگەری تیرۆرستی .

٥٥٪ یان داوای ئەوەیان دەکرد کە پەنجە مۆر وەربگیرێت لەوانەی کە دێنە ناو ئەڵمانیاوە وە ٤٦ ٪ یان داوای ئەوەیان دەکرد کە بێگانەکان بخەنە ژێر بەندیخانەی خۆپارێزییەوە بەتایبەتی لەکاتی بوونی هەر گومانێك لەسەریان .

وە ئەو ڕاپرسییە ئەوەی ڕون کردەوە کە خەڵکەکە ئامادەن کە ئازادی تاکەکەسیان بەرتەسك بکرێتەوە لەسەر حسابی گرتنە بەری ڕێو شوێنی ئەمنی ، ئەمەش جیاوازییەکیان هەبوو لە پێش و دوای ڕووداوەکەی قوتابخانەی بیسلان کە ٤٠٪ یان لەپێش ڕوداوەکەدا پشتگیری خۆیان پیشان دا لەسەر بەرتەسك کردنەوەی ئازادییەکانیان گەر بارودۆخ وا پێویست بکات وە لەدوای ڕووداوەکە ئەم ڕێژەیە بەرزبوەیەوە بۆ ٥٧٪ .






وە ئەوەشی ڕوون کردەوە کە ئەو بار و دۆخ و کەشەی کە ئێستا لە وڵاتدا هەیە وەك ئەوە وایە کە لە ساڵی ١٩٧٧ دا هەبوو کاتێ ئەوکات هاوڵاتیان زۆر بەتوندی هاوپشتی خۆیان دەر بڕیبوو بۆ توندتر کردنی ڕێو شوێنە ئەمنییەکان وابەستەکردنی ئازادیەکانیان بەهۆی ترسیان لە هەر کارێکی تیرۆرستی لەلایەن هەردوو ڕێکخراوی ( سوپای سور و بادر ماینهۆف ) ی قەدەغەکراوەوە .

## ترس لەئیسلام

دەرئەنجامی ڕاپرسییەکان ئەوەی دەرخست کەترسێکی زۆر هەیە لەلای زۆرینەی ئەو ئەڵمانییانەی کە ڕاپرسییەکە گرتونیتەوە لە بەرامبەر ئاینی ئیسلام و وە دایان ناوە بە هەڕەشەیەك لەسەر خۆیان.

وە لەوەڵام دانەوەیەکی پرسیارێك : کە ئایا چی دێت بەبیرو هۆش و هزردا کاتێك گوێبیستی ووشەی ئیسلام دەبیت ؟

## وەڵامەکانیان بەم شێوەیەبوو

٩٣٪ یان بەبیرو هۆشیانادا دێت کە ئیسلام واتە ستەم کردن لە ئافرەت و چەوساندنەویان .

٨٣٪ یان لەبیر و هۆشیاندا ئیسلام بەستراوەتەوە بە تیرۆرەوە .

٨٢٪ یان لەبیریاندا یان باباشتر بڵێین ئیسلام لایان وەك مرادیفێکی دەمارگیری و توندڕەوی وایە .

٦٦٪ ئیسلام لایان واتای دواکەوتن وگەڕانەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست .

وە لەبەرامبەر ئەو راو بۆچوون وەڵامانەشدا کەمایەتییەك لایان وایە کە ئیسلام واتای ئیجابی هەیە لەوانە :

٥٥٪ لایان وایە کەئیسلام بەستراوەتەوە بە ڕێزگرتنی میوان .

٣٩٪ لایان وایە کەئیسلام واتە میراتییەکی شارستانێتی مەزن لەلای موسوڵمانانە .

١٦٪ دەڵێن یەکەم شت کەدێت بەهۆش و بیر و هزریاندا لەکاتی گوێبیستیان لە ووشەی ئیسلام بریتییە لە لێهاتوویی و سەروەریەکانی شارستانێتی ئیسلامی و زاناکانی موسوڵمانان و زانست و هونەر و لایەنە کۆمەڵایەتیەکانیان لە ئەورووپادا کە لە پێش چەند سەدەیەکەوە هەبووە .

٦٪ یان دەڵێن ئیسلام بریتییە لە ئاینی سۆز وخۆشەویستی و هانی خەڵکی دەدات لەسەر چاکە وکاری باش وجوان .

## وەسەبارەت بە هەڵوێستیان لەسەر دراوسێ موسوڵمانەکانیان

٤٦٪ ی بەشدار بووان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ژمارەی موسوڵمانان لە ئەڵمانیادا بە ڕێژەیەکی زۆر ڕوولەزیاد بوونە کە ئەمەش یارمەتی ئەوەدات کە ژمارەیکی زۆر لە تیرۆرستان !! لە نێوانیاندا بوونی هەبێت .

وە لە بەشێکی تایبەتی ڕاپرسیەکەدا ئەنجامی ئەوەی دا بەدەستەوە کە هەڵوێستی هاوڵاتیانی ئەڵمانیا بەرامبەر بە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا و لێپرساوێتی لەبلاو بوونەوەی تیرۆر لە جیهاندا چیە ؟

سێ بەشی بەشدار بوانی ڕاپرسییەکە ئەوەیان ڕەتکردەوە کە لێپرساوێتی ئەوەی لە جیهاندا ڕوودەدات لە کرداری توندو تیژی بخەنە ئەستۆی ئەمریکا .

١٨٪ یان بڕوایان وایە کە ڕووداوی ١١ ی سێبتمبر / ئەیلول لە ئەنجامی پلانێکە کە دەزگای ناوەندی هەواڵگری ئەمریکی Central Intalegent of) Amareca ) ( CIA) دایڕشتووە .

٣٠٪ یان داوایانکرد کە بۆ دوورکەوتنەویان لەو ڕوداوە توندو تیژانە و زامن کردنی سەلامەتی ئاسایشی ناوخۆ لە ئەڵمانیادا کە وڵاتەکەیان دەستبەری هەر هاوپەیمانێتییەکی کە لەگەڵ ئەمریکادا لە بەرەی دژە تیرۆر هەیەتی .

---

## سەرچاوەکان


ماڵپەری کەناڵی ئاسمانی DW ی ئەڵمانی .

ماڵپەری کەناڵی CNBC ئەمریکی .

ماڵپەری رۆژنامەی فرانکفۆرتی ئەڵمانی .

# بیروباوەڕی ئیسلامی ٧

**سەرنووسەر**

وەك لەژمارەی پێشوودا باسی یەکتاپەرستیمان کرد و هاتینە سەر جۆرەکانی یەکتا پەرستی ، سەرەتا بابزانین یەکتاپەرستی ئیلاهیەت چییە ؟ یەکتاپەرستی ئیلاهیەت واتە : بریتییە لە تاك پەرستیتی پەروەردگار لەهەموو جۆرە پەرستشەکاندا ( زاهیر وباتن ) بە ووتەو کردار وە ڕەت کردنەوەی هەموجۆرە پەرستشێك جگە بۆ پەروەرگار نەبێت هەروەك لە قورئاندا لەچەندین ئایەتدا هاتووە و دەفەرموێت ﴿ وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ﴾ (الاسراء٢٣) وە ﴿ وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ﴾ (النساء٣٦) وە ﴿ إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي ﴾ (طه:١٤) وە چەندین فەرموودەوش هەیە لەم بارەیەوە بۆ بەڵگە لەسەر ئەم بابەتە .

جا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە کە ئەویش بریتییە لەوەی کە چی دژی یەکتاپەرستی ئیلاهیەتە ؟ بەڵێ دژی هەیە وە دژەکەشی بریتییە لە هاوەڵگەرێتی ( شرك ) کە ئەمیش دووجۆرە هاوەڵگەرێتی گەورە کە ڕەتی کوللیەتی دەکاتەوە وە هاوەڵگەرێتی بچوك کە ڕەتی کەمالی دەکاتەوە

هاوەڵگەرێتی گەورە چییە ؟ بریتییە لەوەی کەبەندە جگە لەخوا پشتیوان وهانا بەستێت بەغەیری پەروەردگار وە وەکو خوا خۆشی بوێت و لێی بترسێت وەك لێترسانی لەپەروەردگاری وە هانای بۆبەرێت لێی بپارێتەوە و داوای لێ بکات و پەنای بۆ بەرێت و پشتی پێ ببەستێت و مل کەچی بکات لەیاخی بوونی پەروەردگاردا وە شوێنی بکەوێت بەشێوازێك کە خوا پێی ڕازی نەبێت ...هتد ، هەروەك پەروەدگار دەفەرموێت ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ۚ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا ﴾ (النساء:٤٨) وە ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ۚ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴾(النساء:١١٦) وە ﴿ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ ﴾ (المائدة: من الآية٧٢).

هەروەها پێغەمبەر ( ﷺ ) لەم بارەیەوە دەفەرموێت (( حق الله على العباد ان يعبدوه و لايشركوا به شيئا و حق العباد على الله ان لايعذب من لايشرك به شيئا ))

واتە : مافی خوا لەسەر بەندەکان ئەوەیە کە پەروەردگار بپەرستن و بەهیچ شێوەیەك هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن وە مافی بەندەکان لەسەر خوا ئەوەیە کە سزایان نەدات مادەم هاوەڵ بۆ خوا بڕیار نادەن .

ئەمەش لە ( الصحيحين ) دا هاتووە کە بەم هاوەڵگەرێتییە گەر بەئاشکرا بوو ئەوا بەندە لەدین دەردەچێت و وەکو بێباوەڕەکانی قورەیش وایە ، وە ئەگەر بە پەنهانی بێت واتە لە ژێرەوە بێت ئەوا وەك دووڕووە فێڵبازەکان وایە کە وا پیشان دەدەن کە ئیسلامن و ڕوو لەخوان وە لەژێر پەردەشەوە بێ باوەڕن ، هەروەك دەفەرموێت ﴿ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴾ (النساء:١٤٥)﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَاعْتَصَمُوا بِاللَّهِ وَأَخْلَصُوا دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ (النساء:١٤٦) .

ئەمەی کە باسمان کرد کورتەیەکی پوختی هاوەڵگەرێتی گەورە بوو ، جا بابزانین هاوڵگەرێتی بوچوك چییە ؟ هاوڵگەرێتی بچوك بریتییە ڕوپامایی کردن ( ریاء ) لەناواخنی بەندەدا بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە کە پەروەردگار لێرەدا مەبەستی بەم ئایەتەیە ﴿ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ (الكهف: من الآية١١٠) لێرەدا ( شرك الأصغر ) بەواتای ڕوپامایی دێت .

پێغەمبەر ( ﷺ ) لەم بارەیەوە دەفەرموێت (( أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر ، فسئل عنه فقال ( الرياء ) )) .

واتە : ئەوەی کەزۆر من دەترسێنێ و لێی دەترسم بۆ ئێوە بریتییە لەهاوەڵگەرایەتی بچوك ، لەم بارەیەوە پرسیاریان لێکرد کە مەبەستی لەهاوڵگەرایەتی بچوك چییە ؟ فەرمووی ( ڕوپامایی ) . ئەم فەرموودەیە پێشەوا ئەحمەد ریوایەتی کردووە وە دەفەرموێت فەرمودەیەکی صەحیحە .

وە پاشان پێغەمبەر ( ﷺ ) بەفەرمودەیەکی تر ڕاڤەی ئەو فەرمودەیەی بۆکردن کە ئەیش بریتی بوولەوەی فەرمووی (( يقوم الرجل فيصلي فزين صلاته لما يرى من نظر رجل اليه ) ، هەروەها سوێند خواردن بە غەیری خوا وەك سوێند خواردن بە باوك وگۆڕ و کەعبە و ئەمانەت ... هتد لەحەقی ئەمەشدا فەرمووی (( لاتقولوا والكعبة ولكن قولوا ورب الكعبة )) واتە : مەڵێن سوێند بێت بەکەعبە بەڵکو بڵێن سوێند بێت بەخاوەندی کەعبە ( فەرمودەیەکی حەسەنە ) هەروەها فەرمووی ( لاتحلفوا الابالله ) واتە : سوێند جگە لە بەخوا بەهیچی تر مەخۆن ( فەرموودەیەکی صەحیحە ) وە فەرمووی ( من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك ) واتە : هەرکەس سوێند بخوات بەغەیری خوا ئەوا بێباوەڕی نواندووە یان هاوەڵی بڕیارداوە بۆ خوا لەریوایەتێکی تردا ( هاوەڵی بۆ پەروەردگار بڕیارداوە ) .

هەروەها فەرموویەتی (( لاتقولوا ماشاء الله وشاء فلان لكن قولوا ماشاء الله ثم شاء فلان ))ئەم فەرمودەیە پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردووە ، واتە : مەڵێن خوا وفلانە کەس ویسیان لەچی بێت دەیکەن بەڵکو بڵێن پەروەردگار ویستی لەهەرچییەك بێت دەیکات پاشان بڵێن فلانە کەسیش واتە فلانە کەس بەویستی خوا دەتوانێ ئەو شتە بکات .

ئەهلی عیلم دەفەرموون دروستە بڵێی ئەگەر خوا نەبێت و پاشان فلانەکەس کە ویستی خوای لەسەر بووە بەڵام دروست نیە بڵێی ئەگەر خواو فلانە کەس نەبن ئەوا فلانە شت ڕووی دەدا ، جیاوازی لەم دوو دەستەواژەیەدا ئەوەیە کە ئەو( واو ی عطف )ە لێك چوون وهاوشێوە دەکات لەنێوان دوو شتدا واتە لەنێوان پەروەردگار و فلانە کەسدا لێك چوون وهاوشێوە دروست دەکات و دەیکاتە یەك ئاستەوە ، بەڵام کە وتت پاشان وبەویستی خوا ئەوا دانت ناوە بەوەی کە مەشیئەتی فلانە کەس شوێن مەشیئەتی خوا کەوتووە هەروەك دەفەرموێت ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ (الانسان:٣٠) .

خوشك وبرای زندە ئازیز ئەمەی کەباسمان کرد بەکورتی بریتی بوو لە پوختەیەکی یەکتا پەرستی ئیلاهیەت ، پشت بەخوا لەژمارەی داهاتوودا دێینە سەر باسی یەکتا پەرستی ڕبوبیەت .




# ئامۆژگاری لەسایەی فەرموودەدا ...

((عن أنس (ﷺ) عن النبي ﷺ) قال: يسروا ولاتعسروا، وبشروا ولاتنفروا)) متفق عليه.

## باوکی ئاریێز

خوشك وبرایانی ئازیز ئەم فەرموودەیە ئەراڤەکردنیدا زۆر کورت وکەمە بەڵام بزانن کە ناوەڕۆکەکەی پڕیتی لەماناو بەڵگە و ئ ماژەپێکردنی زۆر گرنگ بۆ هەمووان بەگشتی وبۆ کەسانێکی بانگخواز بەتایبەتی .

واتەی فەرموودەکەش ئەوەیە کە پێغەمبەر ( ﷺ) فەرموویەتی : ئاسان سازی بکەن و شت گران مەکەن ، مژدە دەربن و خەڵکی مەتۆرێنن .

ئەوەی کەجێگەی هەڵوێست بێت ئەوەیە کەپێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە بانگخوازە لەکاتی بانگەشەکردنی بۆ دینداری پەرستش و ئاینداری لەسەر مەردومان ئاسان و بار سوك بکات وە کام ڕێگەیەی ئاسان وسانانیە ئەوە بگرێتە بەر و بە خەڵکی ئاشنا بکات و ئاینداریان لەسەر نەکاتە بارێکی گران و داواکاری زۆر وبار گرانی بخاتە سەر خەڵکی و تا ڕادەیەکی وەها کە وا لەخەڵکی بکات لەدین هەڵبێت نەك بەرەو ڕووی بێت ، کە بەراستی ئەمڕۆ دەبینین و دەبیستین زۆر کەس لەم جۆرە بانگخوازی دەکەن بەڵام بێ گومان ئەمە ڕێگەیەکی زۆر هەڵەیە .

جارێکیان خوشکێك هاتە لام و ووتی مـن نوێـژ دەکـەم وە ڕۆژوو دەگـرم و هەموشەوێکیش بەپێ توانا چەند ئایەتێکی قورئان دەخوێنم ، بەڵام بالاپۆش نیم و سەرم ڕووتە ،جارێکیان یەکێك لە رانەی کە هەمیشە خەریکی بانگخوازین پێی ووتم مادام تۆ سەرت ڕووتە خوا هیچت لێ قەبوڵ ناکات وتەنها ماندووبوونەکەت بۆ دەمێنێتەوە هەور نوێژ نەکەی باشتر چونکە سزاکەی دەبێتە دوو ئەوەندە ، جامیش ووتم گەر وابێت ئەوا هەر نوێژ ناکەم و ڕۆژووش ناگرم کەمن زیاند مەندبم تیایدا !! ووتم کێ ئەمەی پێ ووتوی ؟ ووتی : فلانە مەلای لای ماڵی خۆمانەوە وفلانە کەسی خزمان کە بەحساب ئەویش خۆی بە زانایەك وبانگخوازێکی ئاینی دەزانێ !! .

منیش ووتم خوشکم بڕۆ بائەوانە هەر بڵێن تۆ لە پەرستشی خۆت سارد مەبەرەوە و بەردەوام بە بەشکم ڕۆژێك بێتە بێشەوە کە خوا بیخاتە دڵتەوە وئەو فەرزەش بەجێ بگەیەنیت ، خوشکی بەڕێزم باش بشزانە مادام تۆ ئاوا نوێژ خوێن و ڕۆژوگری دیارە بڕوات بەخوا هەیە کە لەسەری کردوێتە فەرز ، لەوەلامدا ووتی ئەرێ وەڵا ووتم ئەی خوشکم هەر ئەوخوایەی کە تۆ مل کەچی فەرمانیت ونوێژی بۆدەکەیت ولێ دەترسی و...هتد هەر ئەو خودایەیە کە فەرمانی پێداوی کە بالاپۆش بە وخۆت داپۆشە و من لێرەدا ناڵێم نوێژ مەکەو واز لە خواپەرستی بهێنە مادام سەرت داناپۆشی بەڵکو هانت دەدەم کە زیاتر بەردەوام بیت لەسەری ، وە خواش هیدایەتی هەموومان بدات بۆ کاری باشتر وچاکتر ، پاش نەك دووهەفتە بینیمەوە کە خۆی بە قەناعەتی خۆی بووەبوە کەسێکی بالاپۆش

جا بەرێزینە ئەمە دانایی و زیرەکی خۆم نیە بەڵکو فەزڵی پەروەردگارە ، دیارە پێشتریش بەخزمەت ئەو فەرموودەیە گەیشتوم بۆیە هەر لەسوتگەی ئەو فەرموودەیەوە وەڵامی ئەو خوشکەم دایەوە

خوشك وبرایان نەرم ونیانی ئاسان کردنی ئاینداری لەسەر خەڵکی واجبە بەتایبەتی لەسەر شانی ئێمە کە بەخۆمان دەڵێین بانگخواز وە بەتایبەتی دەبێت بەرامبەر بەوانەی کە تازە دێنە ناو بازنەی دینداریەوە زۆر ئاسانکار ونەرم بین ونەیانتۆرێنین لە دینەکە .

جارێکیان خۆم لەیەکێك لەمزگەوتەکانی شاردا لەکاتی نوێژی هەینی دا گوێم لە وتار بێژەکە بوو دەیوت ئەو کوڕە گەنجانەی کە دەموچاویان چاك دەکەن موو لادەبەن وپۆشاکی تەسك و کورت دەپۆشن و زنجیر لەمل دەکەن ، ئەمانە هەمووی ناشەرعین ولە دینەوە دوورن پەرستشیان دروست نییە !! کەمنیش سەیرێکی دەوری خۆمم کرد دیتم زوربەی ئامادەبووان لە جۆرە شێوازەن گەر وەك ئەوەش نەبن سیفەتێکیان هەر هەیە کە مامۆستا پێشەوا !! باسی دەکا ، ووتم دەی کەواتە باهەموویان چی دی نەیەن بۆ مزگەوت ونوێژنەکەن ، جا ئایا ئەم ئسلوب وشێوازی بانگشەیە بۆ ئیسلامەتی یان راونانی خەڵکیە لە دین .

من ناڵێم ئەو هەندە سیفەتە شەرعین بەڵام بۆ ئەوانە لە و تەمەن ولەم باردۆخە سەرەتاییەیاندا زۆر ئاساییە ، چونکە ئەو گەنجە کە ئەمڕۆ ئاوا پێشوازی لی‌کرا نازانم چاوەڕێی چی لێ دەکرێ ؟ بەڵکو بەمە چەندین گەنجی پێ ڕاونراوە ولە مزگەوت ودینداری دوورخراوەتەوە ، نابێت کەسێکی وەك ووتار بێژێك لە بڵندگۆی مزگەوتەوە ئاوا شێوازی وتار دانی بێت .

پێغەمبەر ( ﷺ) لەفەرمودەیەکدا فەرموویەتی ﴿ ان الله رفيق يحب الرفق في الأمر كله ﴾ متفق عليه .

واتە : خوای گەورە خاوەنی نەرم ونیانیە و نەرم ونیانی پێ خۆشە لەهەموو شتێکدا .

دەبا ئیتر بەهەموومان ئەم دیاردەیە بسڕینەوە وئاسانی و سانی بخەینە دینەوە نەك قورس و گرانی.



# هەڤبێژانی میحراب


بەرزانی مەلا تەها

## مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەحمەد ئاوا (کەلەیم)[1]

ئەمن کوردم نەوەی کوردم لە نەسلی کوردی کوردستان
کە ئیسلامم لە ئیسلامم بە ئایە وبەوبەوەی قورئان
وە لا نادەم لە ئیسلام و ئەکەم شۆڕش بەرپێ‌ی ئیمان
یەقینە واجبی دینە لە سەر خاکم ئەچم مەیدان


مامۆستا مەلا شێخ موحەمەد — باوکی مامۆستا کەلەیم
مامۆستا مەلا ئەحمەد (کەلەیم)

یاد کردنەوەی ئەو کەڵە زانا و شاعیر و نووسەر و ئەدیبە کوردانەی کە خزمەتیان بە ئایین، نیشتمان، ڕۆشتگەری، داهێنان کردووە، ئەرکێکی فرە بەرز و پیرۆز و گەورەیە، هەستان بە بە زیندوو کردنەوە و خستنە ڕوو وە دەرخستنی لایەنی نەبینراو و نەبیستراوی ئەو زاتانە زەروورەتێکی ئەم قۆناغەی ڕۆشنبیرانە، هەرگیز نابێت خامەکانمان لێ بێ دەنگ بکەن، چونکە هەر ئەوان بوونە کاروانی بانگخوازان و ڕێگاکانی گومانیان بە بیرو عەقڵیان ڕۆشتەکردەوە، هەر ئەوان بوونە کانیاوی سازگاری عیشق و مەحیبەت، بوونە بارانی ڕەحمەت و دڵە ووشک بووەکانی ئێمەیان تێراو کرد.

مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەحمەد ئاوا[2] (کەلەیم) یەکێکە لەو مامۆستا و شاعیرە بەرزانەی کوردستان لە لانکەی هەورامانی جوان و ڕازاوەدا پەروەردە کراوە، یەکێک بووە لەو شاعیرە و دڵسۆزانەی کە هەرگیز بە ئاوات و خۆزگەکانیان نەگەیشتوون، لە مێژوو بە دووی مامۆستایەکی لەو شێوەیەدا دەگەڕام تا بەرکوتێک لە ژیاننامەی و تارێك بەچوکدا لە خزمەت شیعرەکانیدا دا نیشین، بۆ یە بەهۆی دۆستێکی نزیکی خۆمەوە ئاگادار کرامەوە، منیش بە سنگێکی فراوان و بە ئەرکێکی سەرشانی خۆم هەستام بە ئامادەکردن و داڕشتنی ژیانی و گەڕانە زانستیەکانی و بەرهەمەکانی و دواتر چەند لایەنێکی شیعر و شاعیریتی (کەلەیم).

ناوی (مامۆستا مەلا ئەحمەدە کوڕی مەلا شێخ موحەممەدی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ حەمە موڕادە) سەرگەتی یە لەبناری هەورامان.

جەمسەری هۆزەکەی لە نەتەوەی ئیمام عومەرە (خوالێی ڕازیبێت)، باو هۆینشەرە لە کوردستانی ئێراندا بە فامیلی (فاروقی) ناسراون و شۆرەتیان پەیدا کردووە، هەندێك لە هۆزەکەشیان بە (نەقشەبەندی) ناسراون و هۆکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە چەندەها ساڵە پشتاوپشت سۆفیەتی یان بەدەستەوە بووە و لێی نەبڕاون.

مامۆستا مەلا ئەحمەدی خوا لێخۆشبوو ناسراو بە (کەلەیم) لە هۆزێکی گەلێك فراوانی کوردستانە، ئەمیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نیشتەجێی هەردوو هەورامانی کوردستانی (ئێراق وئێران) ن، لە هەورامانی کوردستانی ئێراندا زیاتر لەگوندەکانی (دەمەیەو) و (بارام ئاوا) ن، لەهەورامانی کوردستانی ئێراقیش لە گوندەکانی (دەرەی مەڕ) و (ئەحمەد ئاوا) دا نیشتەجێن.

---

[2] ئەحمەد ئاوا گوندێکی جوان و ڕازاوەی کوردستانە و دەکەوێتە باکووری ناحیەی خورماڵ.






ئەوەی جێی شانازی وباس کردنە ...زنکیان بەمەلایەتیەوە سەر قالبوون و ...ەرقالن ، بەهۆی مەلایەتیەوە ...یشتەجێی شوێنانی تر بوونە ، ئەم زاتە ...یەکێك بووە لەو مامۆستا گەورانەی کە هەر ...ەمندالی یەوە سۆزو خۆشەویستی ئایین ...دەیگرێ و لە سالی ( ١٣١٦ ك ) دەستی کردووە بەخوێندنی زانستە شەرعییەکان ، سەرەتای زۆرێك لەزانستەکانی تەواو کردووە . بە فەقێیەکی ژیر ووریاو بزێو ناوی دەر کردووە ، هەمیشە تامەزرۆی خوێندنی زانستەکانی تری فەقێیەتی بووە ، هەر ئەمەش وای لێ کردووە کە زیاتر بەدووی زانست وزانیاریدا بگەڕێت ، لەگەلێ لە ناوچەکانی کوردستاندا وانە و دەرسی شەرعی خوێندووە ، لەو ناوچانەی کە هەمیشە جێگاو مەکۆی زانست بوونە ، بۆ ئەم مەبستەش ڕووی کردۆتە هەلەبجە ولە وێنشەوە بۆ هەولێر و ڕەواندوز و دواتر چۆتە سلێمانی لەوێشەوە بۆ پێنجونو پاشانیش چۆتە مەریوان و کەرەج وگەلێ لەناوچەی دی وەك ( خۆشناو ـــ سنە ـــ دزەیی ـــ شارباژێر ـــ ژاوەڕۆ ـــ شارەزوور ـــ گاوەڕۆ ـــ هەورامان ـــ کۆیە ـــ سنە ـــ مەنگور ـــ شامیان ـــ پشدەر ـــ برادۆست ـــ مەرگە ـــ قەرداغ .... هتد).

لە سەر دەستی مامۆستا پایە بەرز وخواناسەکانی وەك ( مامۆستا مەلا شێخ موحەممەدی باوکی ، مامۆستا مەلا سەعیدی صەداوا ، مامۆستا مەلا عەبدول کەریمی مودەریس ، مامۆستا مەلا عەبدول عەزیزی پریس ، مامۆستا مەلا عوسمان عەبدول عەزیزی پریس ، مامۆستا مەلا سەید بابە شێخی ئیلمانە ، مامۆستا مەلا مەعروفی خاوێ ، مامۆستا مەلا باقری بالك .. هتد).

مامۆستا مەلا شێخ موحەممەدی باوکی هانێکی زۆری داوە بۆ خوێندن و هەمیشە داواو وەسیەتی ئەوە بووە کە بخوێنێت تا بەهۆیەوە خزمەت بەگەلەکەی بکات ، لە گرتگترین زانستە شەرعیەکانی ئەو دەمەی فەقێیەتی خوێندووە لەوانە ( علم النحو والصرف ـ علم البلاغة ـــ علم الحديث ـ أصول الدين ـــ علم الفقه ـــ علم أصول الفقه ـــ علوم القرآن ـــ علم الكلام ـــ علم المنطق ... الخ ) .

ئەم زاتەلەسالی(١٣٧٦ ك - ١٩٥٦ ز) لەشاری سلێمانی لە لایەن مامۆستای خوا ویست ( مامۆستا مەلا مەعروفی خاوێ ) مودەریسی مزگەوتی( بنتەبەقی ) ئەوکات ئیجازەنامەی دوانزە عیلمی و ئیجازەی فەتوای شەرعی پێدراوە ، پاشانیش بە فەرمانی مامۆستایانی ئاینی کراوە بە مودەریسی مزگەوتی( شێخ عەبدولکەریمی شێخ عەبدولقادر ) شێخی تەریقەتی ( قادری )لە گوندی( کریچنە ) لەناحیەی سەنگاو لە لیوای کرکوك ، دواتر بۆتە مەلای گوندە " گرێزە " ی سەر بەناحیەی ( سەید صادق ) ، پاشان بەناچاری لەبەر قورسی باری ژیانی لە سالی ( ١٩٥٩ ) بۆتە موچە خۆری میری ، سالی ( ١٩٨٨ ) پاش کیمیابارانی هەلەبجەی شەهید ئاوارەی کوردستانی ئێران بووە و لەوێ نیشتە جێبووە ، سالی ( ١٩٩١ ) گەڕاوەتەوە کوردستانی ئێراق و کراوەتە قازی شەرعی هەلەبجەی شەهید تاسالی ( ١٩٩٤ ) .

مامۆستای خواناس دەستێکی بالای لە نووسین وشیعردا هەبووە ، ئینشای زۆر جوان وخەتێکی گەلێ ناوازەی هەبووە ، زۆرێك لەکتێبە شەرعیەکانی ئەوکاتی بەدەستی خۆی نووسیوەتەوە .

لە بەرهەمە چاپداوەکانی :-

١- کتێبی ( پێشهاتی مەرگ ) سالی " ١٩٦٥ " لە چاپدراوە .

٢- کتێبی ( ڕشتەی پێغەمبەر ﷺ ) کاك عەبدوللای کوری مامۆستا هەستاوە بەکۆکردنەوە وئامادەکردن وپاشان لە چاپدانی لەسالی ( ٢٠٠٠ ) دا .

مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەحمەد ئاوا ( کەلەێم ) بەزمانی عەرەبی چەندین حاشیەی لە سەر کتێبەکانی ( فرائض شرح المنهج ـــ منطق تفتازانی ـــ فەریدەی سیوطی ـــ ایساغوجی ـــ تصریفی مەلاعەلی ـــ کفایە البیتوشی ـــ کتێبەکانی " عە روض " ) تۆمارکردووە.

شارەزاییەکی زۆری لە زمانی عەرەبی وفارسی دا هەبووە و شیعری هۆنیوەتەوە ، بە دیالێکتی هەورامیش شیعری ووتووە ، سوارچاکێکی تیژڕەوی ئەو مەیدانە بووە ، مامۆستایەکی خزمەتگوزار وبەئەمەك بووە ، هەمیشە حەزی بە تێکەلی خەلك کردووە ، ڕوویەکی خۆشی هەبووە ، زۆرخۆبەکەم گر ( متواضع ) و و کەم دووبووە ، زۆربەی کاتەکانی لە مزگەوت و قورئان خوێندندا بەسەر بردووە ، گەلێ فەقێی تێگەیشتووی پەروەردە کردووە ، لە تەسەوفیشدا پایەیەکی بەرزی هەبووە ، ڕەوشت بەرزو قانیع و بەعیزەت بووە ، بەهیچ جۆرێ لە دونیا وو ئەهلی دونیا نزیك نەبۆتەوە .



مامۆستا مەلا سەید ئەحمەدی پێنجوێن دەفەرموێت :فەقێیەکی زۆر بە تەقواو ئینسانێکی زۆر موسوڵمان بوو ، ڕەوشت جوان بوو بە ( قەناعەت ) بوو ، لەبنەماڵەیەکی بەرێزو ڕەفتار جوانن ، زووربەیان خوێنەوار ومەلان ، مەرحومی باوکی زۆر ئەشعار ونوکتەی جوان جوانی لەبەر بوو یەك جار لە مەجلیسیا دانیشتووم حەزم دەکرد چەند چارێکی دی بەخزمەتی باوکی بگەم .

سەرەنجام مەرگ بووە یاوەری لە ئێوارەی ڕۆژی ( ٩/ ١٢ / ١٩٩٦ ) لە ئەحمەد ئاوا لە کاتی نوێژی مەغریب وو لەسەر بەرماڵ بۆ دواجار چاوەکانی لێکناو ماڵئاوایی کرد ، بەبوتەی کۆچی دوایی ( کەلەێم ) وە زۆر لەشاعیانی کوردستانی ئێران مەرسییەیان بۆگێڕاوە ، ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی شاعیری کوردستانی ئێران (مامۆستامەلامحەمەد ئەمینیمیزایی )

## شین بۆ مامۆستا مەلا ئەحمەد

کوڕە کوردەکەی شاخی هەورامان
هەڵپەرستاوی ئاباری زەمان
چەندە بەئاوات بووی بۆ ئازادی گەل
چەندگەڕای لە شاخ دەشت ودۆڵ وکەل
بۆ عەجایباتی ژینی کوردەواری
سبحان الله ت کرد هەزار بەهەزار
بەهاری عومرت بە کوێرەوەری
بەداخ وهیجران بەدەر بەدەری
تۆش هەوەک کوردی بەش براو لە ژین
سەرسام ومات وپەژموردە و بێ تین
گەڕای بەم هەموو ئەرزی خودا
هەرگیز ڕات نەکەوت وەلای صەفادا
پاییزی عومرت بە ئاخر خەزان
تەنها گەلاکەی زەردی هەلوەران
بەروحی بەرزی روخسار بەهاری
کۆچی خێرت کرد لە ژین بێزاری
چوون لە کۆشی دڵ ڕوا بوو بەخت
جا خەمخۆری کەوم هات بۆ تاربەخت

## شیعرو شاعیرێتی ( کەلەیم )

مامۆستا مەلا ئەحمەد لە شیعردا نازناوی ( کە لەێم ) ی لەخۆی ناوە ، بەچەند نازناوێکەوە شیعری وتووە لەوانە ( کەلەیم ، عەبداڵ ، مەلای هەورامان ) بەلام لەکۆتایی زۆرێ لەشیعرەکانیدا نازناوی ( کەلەێم ) ی بەکار هێناوە و بەم ناوەشەوە دەناسرێت ، ( کەلەێم ) لە شیعردا دەستێکی باڵای هەبووە بەسروشت شاعیرێکی خێر لەخۆ نەدیو بووە ، بە زمانەکانی فارسی و عەرەبی و دیالێکتی هەورامی و دیالێکتی کرمانجی خواروو شیعری هۆنیوەتەوە ، خاوەن بیرێکی بەرزو شێوازێکی ڕەوان و هەستێکی ناسك و مەبەستی جوان و واتای دوور وقوڵ بووە ، شیعرەکانی لە چاوگەیەکی ڕوون ڕەوانەوە هەڵقوڵاون ، لە تێڕامان و وورد بوونەوە لە شیعرەکانی دەر دەکەوێت کە ڕەنگێکی کوردەواری و خۆماڵی پێوە دەدرەوشێتەوە ، باس لەدیمەنەکانی سروشت و بەهاری ڕازاوە و بەسەر هاتی مێژوویی و گەلێ بابەتی تر کردووە .

کتێبی پێشهاتی مەرگ کە پێشتر ئاماژەمان پێدا یەکێکە لەو کتێبە ئاینیانەی کە لەسەردەمێکی زۆر ناسکدا نووسراوە ، کەمێك لەنووسەران لەو سەردەمەدا توانای نووسینیان هەبووە . ( پێشهاتی مەرگ ) کتێبێکی هەمەلایەن و گشتگیرە ، گەلێ لەبابەتەکانی وەك ئامۆژگاری ، چیرۆك ، پارانەوەی لەخۆگرتووە ، بۆ ئەم مەبەستەش ڕێگەی شیعری هەڵبژاردووە ، زۆرێ لە وێژراوەکانی فەیلەسوفی ئیسلامی ( پێشەوا غەزالی ) بە شیعر هۆنیوەتەوە و داڕشتووە .

کتێبی ( ڕشتەی پێغەمبەر ) کتێبێکی ئایینی بەشیعر چنراوە ، ژیانی پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد (ﷺ) تێدا هۆنراوەتەوە ، هەر لەسەرەتای لەدایك بوونیەوە تاوەکو وەفاتی ، ئەوەی جێی ئاماژە پێکردنە لەم کتێبەدا گەلێ لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ی بەشیعر داڕشتووە .

( کەلەێم ) لە کیمیابارانی هەڵەبجە دا دووان لە دیوانەکانی سووتاون و بوونەتە قوربانی سیاسەتی شۆڤینیانەی بەعس ، دیوانێکی دەست نووس ( مخطوطە ) ی لە پاش بەجێماوە و لەچاپ نەدراوە .

## کەلەیمی شاعیر لەگەڵ بابەتەوە شیعری هەیە لە ستایش

## ( مناجات )

تۆ ( کریم العفو ) ی باری هەم خاوەنی لوتف وعەتا
من ( کپیر الزنب ) و گومڕا و بەد لەواو پرخە تا
صەد درێخ لەم عومرە پوچەم وا لەدەم کەل ڕۆی بەسالْ
وا کەگرتی ڕێی بەتالێوْ وا بوو ئیمرۆ پایە مالْ
چەندە جار کردوومە تۆبە هەر لەسەر کرداری بەد
عاقیبەت یەک یەک شکاندم ( یاکریم ) و یا ( صمد )
حەقی گیانی پاکی ( ئەحمەد ) خۆت بە ( مختار ) داوتە باز
تۆ پەنامدە ڕۆژی مەحشەر هەم بدە پێم ڕێی نیاز
تا ببم یارت یاوەکوو یاوەری یاری ( صدیق )
دوور لەغەریر بم ریْ گوزەرکەم تا بەقاپیت بم رەفیق
خۆ بریندارە کە لاشەم ناگەمە پێمە حچور
تۆ ببەخشە گشت گوناهم تابیْ بیْ بۆم ڕێی عبور .

## شیعری نەتەوایەتی

ئەمن کوردم نەوەی کوردم لەزاری کوردی عەلەم دارم
لەکوردی کوردی کورد خوازم بەقوربانیش کە دیلدارم
فیدای ڕۆحی کەسانیْ بم کە کورد بێژی بێدارم
بەماڵ و ڕۆح سەر وگیانم هەتا مردن فیدا کارم (٣)

## شیعری فەلسەفی : کەلەیم گەلێ شیعری دەرهەق

بەفەلسەفەی ژین هەندێشتی ترەوە هەیە وەك :

زبد خویان کەنارگیری فرازە اســـت
کسی عاقل بوو رایی نیازە اســــت
نەدارد کەس بەبد خویان أمیدی
نە از دنیا نە از عقبی بە بعـــدی
( کەلەیما ) فکر با بهوشت عمیق است
ج خلقتها زیکد بگر فریق اســــت (٥)

واتە :
لە بەد رەفتاران دووری گرتن سەرکەوتنە ، بەلاّم لەگەلّ عاقلاندا پەند وەر گرتنە و بە نیاز گەیشتنە ، ، هیچ کەس هیوای بە بەدخو بەد رەفتار نی‌یە ، نەلەم جیهانەدا نە لە پاشە ڕۆژدا ، ئەی ( کەلەیم ) بیرکردنەوەکانت ئەو قسانەی تۆ دەیکەی بیرێکی قووڵە و هەموو سروشتەکان وەك یەك نین .

## لاواندنەوە

کەلەێم کوڕێکی لە سەرچاوەی زەلّمدا خنکاوە و کاریگەری‌یەکی دەروونی زۆری لەسەر دروست کردووە بەم شێوەیە و بە دیالێکتی هەورامی مەر سیەی بۆ گێڕاوە :-

چەرخی سیا رەنگ چەرخی سیا رەنـــگ
سیات کەر چارەم بیْ رەنگ وبیْ دەنگ
زیللەت بی وەررات وەی ژیللەتی مــن
ررات لەبۆورە ررا هەر بوت ئاهی من
چەرخێت ئاوردەن سوزاش تازە وکۆن
زبرێوەت شانان نەبیەن غەبـــــوون
کەردت وەنامم سیـــاچـــارەی و ێم
مەغروقیت ئاوەر وە مەغروقی و ێم
نگینم بــــەروت سیات کــــەر وێنەم
زەلیلت ئــــــاوەر ئــــارای دووبینـــەم
دەرکەر جەدەستم نووری دوو وێنـــەم
ڕریشەی هۆشوو ژین لابەری کی نەم
شوڵەی خەیاڵم وە جاخی بەرگــــــم
یاریدەی هەواو رریشوڵەی جەرگـــم
داوام کــــەر جــەلای ( رب العالمین )
چەرخی باوەرۆ کـــــــە روت بیْنگین
خواوە چەرخیْ چەرخت دو هــــەدەر
هەتالای ( کەلەیم ) نەمە نۆکـــــەدەر

## ئامۆژگاری

( کەلەێم ) ئامۆژگاری کۆمەلاّنی کوردستان دەکات و دەفەرموێت:

بۆگەل و خاک و نیشتمـان بـــەد تـر چـی یـــە
هێرشی چەوت و خەیانەت مەنبـەعیکی تر نی‌یــە
لابەرن ڕێگەی خەیانەت ئەی گەلی کوردی نەجیب
بانەمێنیْ نەگبەتی کورد بەس هەوە هۆی ترنی‌یــە (٥)

چەندان بابەتی تر کە هەریەکەی بەبوتەی شتێکی تایبەتەوە گورتووە.

---

(٣) یەکێکە لە شیعرە بلاّو نەکراوەکانی ( کەلەێم )

(٥) یەکێکە لە شیعرە بلاّو نەکراوەکانی ( کەلەێم )



*نموونەیەک لە شیعرە بڵاو نەکراوەکانی دیوانی*

*( مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەحمەد ئاوا ) کە لەیم*

چاک بزانن مەردی کوردی دەعوەتی کوردان ئەکا
بۆ حقوقی قەومی کوردی چوون گەلی مەردان ئەکا
هەئەلێ فەرزەو وجوبە ڕووت بەڕووی مەیدان ئەکا
تاهەدەف نەهبی نهائی ڕۆستەمی پەیمان ئەکا
خوێنی کوردان کاڵ وسووری قورمزی نیشان ئەکا
بۆسبووتی دەوری شۆڕش شاهدی کوردان ئەکا
شۆڕشت تیمسالی کوردە خۆ بە عەهد وپەیمان ئەکا
ڕۆڵەکانی وان لەڕیزا شۆڕشی مەردان ئەکا
گێژەوو لوولی دووژمنی لاچوون مژی زوستان ئەکا
ڕۆژبەڕۆژ عیشقی بەسۆزی ڕوو بەڕووی ئیمان ئەکا
خوێنی کوردان کاڵ وسووری قورمزی نیشان ئەکا
بۆسبووتی دەوری شۆڕش شاهدی کوردان ئەکا
وا گەل وهۆزی نەبەزمان رۆبەڕۆ پەیمان ئەکا
عالەمی هەستی سەراسەر موعجبە دەوران ئەکا
شاهیدە یەکسەر بەجارێ لەو نەوشە حەیران ئەکا
بۆنیزالی قەومی کوردان شۆڕشی سامان ئەکا
خوێنی کوردان کاڵ وسووری قورمزی نیشان ئەکا
بۆسبووتی دەوری شۆڕش شاهدی کوردان ئەکا
میللەتێکی وا جەسوورە شۆڕشی مەردان ئەکا
چەکی دەستی تاپڕ وحسک ساچ مەزەن شایان ئەکا
ئەم جیهانە گشت بەیەکسەر سەر بەسام هەیجان ئەکا
وا بەرامبەر تۆپ و هۆک وئەسلەحەی عەسران ئەکا
خوێنی کوردان کاڵ وسووری قورمزی نیشان ئەکا
بۆسبووتی دەوری شۆڕش شاهدی کوردان ئەکا
وانەزانن ئەم ووتارە سەر بەخۆ نە بەزمان ئەکا
هێرشی شۆڕش بەبێ شک وێژەران نیشان ئەکا
شۆڕشی کوردان لە مێژە شەقڵی چاوی دژمان ئەکا
ئەی کەلی ( نووحی ) پەیەمبەر دژ لەتۆ ئەفغان ئەکا
خوێنی کوردان کاڵ وسووری قورمزی نیشان ئەکا
بۆسبووتی دەوری شۆڕش شاهدی کوردان ئەکا
چی نیزامی شەرق و غەربە ، کۆن وتازەی هان ئەکا
بۆ نەمانی شۆڕشی تۆ داڵغەی فەوتان ئەکا
تۆ بەنانی ووشکی بێ ئاو ڕووت بەڕووی دوژمن ئەکا
چەن زەمانە چەند کاتە مەردی تۆ مەیدان ئەکا
خوێنی کوردان کاڵ وسووری قورمزی نیشان ئەکا
بۆسبووتی دەوری شۆڕش شاهدی کوردان ئەکا
عەسری ئەمڕۆ تەبعە ناوت لای گەلان باسان ئەکا
تۆ نەکەی لادەی لە شۆڕش گەل بە تۆ شایان ئەکا
بەرنەدەی دەستت هەتا هەی فرسەتت ئامان ئەکا
شەعبەکەت بێ شک بە مێژوو بەد گوومان نیشان ئەکا
خوێنی کوردان کاڵ وسووری قورمزی نیشان ئەکا
بۆسبووتی دەوری شۆڕش شاهدی کوردان ئەکا

[illegible]



نووسینێکی بڵاو کراوەی مامۆستا ( کەلەیم )



زنجیرەی [ ١ ]

پیشـــهاتی مەرگ

نموونەیەکە لە نموونەکانی پیشهاتی مەرگ

[ بە پێ نووسی ]

« احمد شیخ محمد شیخ عبدالله شیخ محمد مراد »ی

دەرەمەڕی ـــ لە هەورامان

لە سالی ١٩٦٥ م ـــ ١٣٨٥ ه

دانـــراوە

١٩٧٠ م

لە چاپ دانەرەی بە دەست دانەرە

بە ڕەزامەندی وەزارەتی [ ڕاگەیاندن ] لە چاپ دراوە .

# ڕاگەیاندنی ئیسلامی
# ( شێوەکانی و ئەرکەکانی )

ن/ شێخ عەلی ئوسامە

وەرگێڕانی / ڕاستی غەفور فرج

ڕاگەیاندن بەیەکێك لەهۆکارە گرنگەکان دەژمێردرێت کە توانای هەیە کاریگەر وسەلمێنەر بێت وە دەنگێکی بیسترا و وەخاوەنی توانایەکی ئەوتۆیە کە بیستن و عەقڵ و ویژدانی مرۆڤی هاوچەرخ ببڕێت ، وەدەگاتە قوڵایی بیر و زەوق و ڕۆحی مرۆڤ بۆ پێش کەشکردنی ئەوەی کە بڕوای پێیەتی و وێنەی بۆکێشاوە .

ڕاگەیاندن لەبنەڕەتدا کەناڵێکی بێلایەنە دەتوانرێت بەکار بهێنرێت لەچاکو بلاوکردنەوەی هەموو شتێکی جوان لەناو خەڵکدا هەروەهاش دەتوانرێت بەکار بهێنرێت بۆ خراپەو کاری ناشرین ، لێرەوە پێویست بوو کار بۆ زورینەی ڕاگەیاندنێکی ئیسلامی هاوچەرخی جیا بکرێتەوە کە دژایەتی ربەر بەرەکانێتی خراپی لە ڕێ لادراوی وون کەر بکات ، ئەوەی هەوڵی بەئامانج گەیاندنی نامەی ئیسلام بدات و گەیاندنی ماناکانی بەڕێگە دروستەکان وە بۆ ئامانجە پیرۆزەکان کە ئیسلام لەبنەڕەتدا هەوڵی بۆ دەدات بەبێ هیچ شتێکی‌تر ...

ڕاگەباندنی ئیسلامی ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لەبەڕێوە بردنی کۆمەڵگا وڕێگە نیشاندانی ڕای گشتی ، بلاوکردنەوەی هۆشیاری ئیسلامی وسووربوون دووپات کردنەوە لەسەر ئاینی ئیسلام بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤایەتی لەوون بوون سەر لێشێوان ، نامەیەکە بونیات نراوە لەسەر بنەمایەکی نەگۆڕ وە پێوانەیەکی وەرگیراو لەبیرکردنەوەیەکی ئیسلامی گشتی بۆ گەردوون و ژیان و مرۆڤ بەڵام ئەو پرسیارەی کە خۆی دەخاتە ڕوو ئەوە کەدەڵێت

* ئەگەر ویستمان ڕاگەیاندێکی ئیسلامی جیاوازمان هەبێت ، ئایا شێوەی ئەو ڕاگەیاندنە داواکراوە چییە ؟ وە نیشانەکانی چییە ؟ هەروەها ئەو پێویستی و کارانەی کەلەسەر ئەوڕاگەیاندنە یە چییە ؟

وەلام :- پێش هەموو شتێك دەڵێین قورئانی پیرۆز وێنەی ئەو مەشخەڵی ڕاگەیاندنە ئیسلامیەی بۆ کێشاوین کە وەرگیراوە لەدەستووری بانگەواز و ڕاگەیاندن و ڕێ نیشان دان ...... هەروەکو لەقورئانی پیرۆزدا نزیکەی ( ١٧٠٠ ) ئایەت دەربارەی ڕاگەیاندن هاتووە تەنها لەپیتەکانی ( ق ، و ، ل ) ئەمەش بۆ ئەوەی ترسناکێتی و گرنگێتی ڕاگەیاندن و ڕۆڵی لە بانگەواز کردن وگەیاندنی ئاینی ئیسلام بە مەردومان .... بەڵکو خوای گەورە وەسفی ئەم نەتەوەی ئیسلامە دەکات و دەفەرموێت ( ئەم باشترین نەتەوەیە کەخراوەتە بەرچاوی مرۆڤەکان ) چونکە ( فەرمان بەچاکە دەکات ) کە ئەمەش بابەتێکی ڕاگەیاندنییە ( وە نەهی لەخراپە دەکات ) کە ئەمەش دووبارە کارێکی ڕاگەیاندنییە ( وە بڕوایان بە پەروەردگاری بالادەست هەیە ) .

هەروەکو لەقورئانی پیرۆزدا چەندەها ئایەتی ڕەوان وئاسان دەبینین کە فەرمان بەموسوڵمانان دەکات کە فەرمایشت و ووتەکانی پەروەردگار بگەیەنرێت بەمرۆڤەکانی دەوروبەر بۆنموونە پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿ قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾ (یوسف:١٠٨) ، هەروەهادەفەرموێت ﴿ بلغوا عني ولو آية ضرب مبلغ أو على من سامع ﴾ .

لە ژیاننامەی پێغەمبەریشدا (ﷺ) دە بینین کە چۆن سودی لەگەورەترین هۆکاری ڕاگەیاندن بینیوە لەو سەردەمەدا کە ئەویش هۆتراوەیە کە بەکاری هێناوە بۆ بانگهێشت کردن بۆ ئیسلام و بەرگری لێکردنی ، وە مینبەرێکی بۆ شیعر بونیات ناوە لە ناو مزگەوتدا وە بە شاعیرەکانی فەرمووە کە لە دژی بێباوەڕەکان شیعر بڵێن و بنووسن وە بە ( حەسانی کوڕی سابتی ) فەرمووە " شیعر لەدژی بێ باوەڕان بڵێ چونکە ڕۆحی قودوس لەگەڵ تۆدایە ... " .

نەك هەر شیعر بەڵکو ئاینی ئیسلام جۆرەها ڕاگەیاندنی بەکار هێناوە بەپشت بەستن بە زۆرێك لەو دروشمانەی کە لەئیسلامدا هەن و شێوەی ڕاگەیاندنیان هەیە ، وەکو : بانگدان کە ڕێگەیەکی ڕاگەیاندنی گرنگە ، کە بیر وباوەڕی مرۆڤی‌موسوڵمان و بنەماکانی ئیسلام لەچەند ووشەیەکی کەمدا دەخاتە ڕوو هەروەها نوێژی بەکۆمەڵ ونوێژی هەینی‌وتارەکەی و



و نوێژی هەردوو جەژنەکە ،ئەمانە هەموویان لەبەهێزترین و سەرکەوتووترین هۆکاری راگەیاندنن ، وە ئەمانە هومووی جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئاینی ئیسلام ئاینێکی راگەیاندن وهەواڵ وبلاوکردنەوە وبانگەواز و رێ نیشان دانە .

**سیفەت ونیشانەکانی راگەیاندنی ئیسلامی**

**١- راگەیاندن بیر وباوەرە :**

لەبنەرەتی ئەقایدیەوە دەردەچێت گرنگی بەکەسەی برایەتی وئاراستەکردنە بۆ سەر شارێگەی گەیشتن بەپەروەردگار تەنها بە خواپەرست ویەکتاپەرستی .وەئەم راگەیاندنە دەگەرێتەوە بۆ قورئانی پیرۆز وسوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و رێبازی شەریعەتەکەی گرتوەتەبەر لەهەموو ژیاندا ... هەروەها بنەما ئەخلاقی وسیاسی وکۆمەلایەتی وئابووریەکانی لێوەرگرتووە ، وە راگەیاندنی ئیسلامیش تێدەکۆشێت بۆ پاراستنی ئەم بنەمایانە و جەخت کردنەوە لە سەریان و پابەند بوون بە بەرنامەی خوا لە گشت کاروبارێکی دونیادا .

**٢- راگەیاندن پابەند بوونە بەدادپەروەری و پێوانەیەکی راست دروستەوە :**

ئەم داد پەروەریە و پێوانە راست و دروستە بەارو دۆخ هەرچۆنێك بێت لانادات بەلای هیچ کەس و چین ورەگەز ونەتەوە یەکدا و یاخود بەلای سودمەندییەکی مادی یەوە ، کە پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ ﴾(النساء: من الآية١٣٥) ، بەم

شێوەیە ویژدانی موسولمانی راگەیەنەر و رۆشنبیریە رەسەنەکەی رۆحە دلنیاییەکەی دە بێتە پالنەرێکی بۆ ووتنی هەق جا ئیغرا مادی وسیاسی وفشارە کۆمەلایەتیەکان هەرچەندە بێت .

**٣- راگەیاندن لەخزمەتی هەمەوندایە :**

نەك لە خزمەتی کەسی دەسەلاتدار یان سیستەمەکەی یان خێزان و بنەمالەکەی هەروەکو چۆن ئێستا وایە لەهەندێ لەولاتە عەبیبە بەناو ئیسلامەکان بەلکو راگەیاندنی ئیسلامی بەتەواوەتی تەرخان کراوە بۆ هەلگرتنی بانگەوازی ئیسلامی وبلاو کردنەوەی و ئامادەکردنی رۆح و نەفس بۆ رازی بون بەئاینی ئیسلام و سیستەم وشەریعەت ودەوڵەتەکەی ، ئائەوە راگەیاندنێکی سەرتایی ودابین کراوە بۆ خزمەتی ئیسلام .

لەدوای ئەمانە هەمووی ... لەدوای ئەوەی کە کاریگەری راگەیاندن سیماکانیمان زانی پێویستە کە ئاماژە بدەین بە ئەرك وفرمانەکانی راگەیاندنی ئیسلامی ناوبراو بەتایبەتی لەم کاتەی ئێستاماندا :

١- ئاگادارکردنەوەی موسولمانان بەوەی کە رۆژانە لە دەوریان روودەدات لەو کارو بارانەی کە زیان دەگەیەنێت بە ژیان وبەرژەوەندیەکانیان و وحاڵ ئەحوالیان وە راڤەکردنیان بۆیان لە بەر رۆشنایی باسا ورێسا وئەحکامە ئیسلامیەکانەوە .

٢-ناساندنی دۆسیە ئیسلامییەکان وقایلکردنی رای گشتی و جیهانی بە دادپەروەرێتی وگرنگیتیان .

٣- رو تێکردنی رای گشتی لە ولاتانی موسولمانان بەپێی بنەماکانی ئیسلام وئەوە کە خزمەت دەگەیەنێت بەئیسلام .

٤- ئاماژەکردن بۆ رەوشتی ئیسلامی و هاوکاری و پشتگیری رەگەزە ئیسلامییە پێشرەوەکان وە تۆمەتبارکردنی ئەو جۆر رەوشتانەی کە پابەند نین بەیاسا ورێساکانی ئیسلام ، وەگرنگی دان بەدەرخستنی شوێنەوارە کوشندەکانی .

٥- بەرە و روو وەستاندنی ئەو بانگەوازانەی کە رێگە لەخەلك وون دەکات وە ئامانجی موسولمانان وولاتەکەیانە .

٦- نزیککردنەوەی بۆچوونە بینینەکان لەهەموو ولاتە ئیسلامیەکاندا وە کار کردن لەسەر نەهێشتنی جیاوازی و دوبەرەکایەتی .

لەکۆتاییدا دەڵێم : کە پابەند بوون بە راستی وهەقەوە کارێکی پێویستە وە بانگەواز کردن بۆ ئەوەی کە بەرنامەکەی خوا فەرمان رەوا بێت ئەمە ئەرکێکی سەر شانی هەموو موسولمانانە ... وە بلاوکردنەوەی ئیسلام وبەرگری لێکردنی لەکارە پێویستەکانی سەرشانی موسولمانانە ، لەبەر ئەوە موسولمانان داوا لێکراون بەراگەیاندن وبانگەواز کردن بۆ لای خوا هەتا لەتوانایاندا هەیە . وە ئێمەش لەم رۆژەدا پێویستمان بەکسانێکە کە تێبکۆشن لە رێگەی خودادا بەهەموو شێوەیەك وە هەروەکو چۆن سەربازێك دەجەنگێت بەچەکە جۆراو جۆرەکان ... ئەگەر نا ئەوەی کە مامۆستایەکی ئاینی لە مزگەوتێکدا ومامۆستایەك لە قوتابخانەیەکدا و بانگخوازێك بونیاتی دەنێت لەچەند ساڵێکدا ، راگەیاندنی خراپ لەچەند کاتژمێرێکدا دەیروخێنێت .

دەنگی ئیسلام پێویستە بەرزبێتەوە هەتا دەنگی بێباوەران و رێ وونکەران بخنکێنێت و نەیهێڵێت وە هاتو هاواریان وەك هەوا بروات و نەمێنێ ...

**سەرچاوە**

گۆڤاری ( الرباط ) ژمارە " ٣ " ــ ساڵی یەکەم ( شوال ــ ٢٠٠٣ )




# ٨٧ ڕۆژی بەختەوەری

**م . عەبدوڵلا عومەر**

**ئایا هیچ ئارەزویەکت هەیە کە لەکاتی پشووەرگرتندا یان لەکاتی دەست چوڵیت لە کارەکەتدا مومارەسەی بکەیت ؟**

ئارەزووەکان بریتین لە چەند ڕێسگەیەکی چێژ وەرگر لە مرۆڤ تێدا هەڵوێستە دەکات بۆ ئەوەی سروشتی خۆی بدات بەدەستیەوە وئارام بێت لەو کارەی کە ئارەزویەتی .

وە پێدەچێت هەموو لایەك بەبێ جیاوازی هەریەکەو ئارەزوویەکی هەبێت وە یان هەندێ کەس مومارەسەی دەکات بەڵام ناوی لێ نانێت ئارەزوو .

منداڵ کە ئەو نزیکترینە بۆ سروشتی مرۆییەوە مومارەسەی ئارەزویەکی تایبەتی خۆی دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە سەر یاریەکی تر ناو بەناو ، وەکاتێك کە گەورەش دەبێت ئارەزوویەکی دیاری کراو هەڵدەبژێرێت وەك نموونە " کۆکردنەوەی پوول ، کۆکردنەوە وناردنی نامە ، کۆکردنەوەی وێنە ...هتد ) .

بەڵام کەسی گەورە لەوانەیە ئارەزووەکەی بەپێی ئەو بارودۆخ و ژینگەیەی کە تێیدا دەژی هەڵبیژێرێت کە لە ئارەزووی کشتاریەوە دەست پێدەکات ولە ئارەزووی سیاسەتدا کۆتایی پێدێت ، وە ئارەزووی مەلەوانی وسواری و ڕاو ، نووسین ، خوێندنەوەی کتێب ... هتد دەگرێتەوە.

بەهەر حاڵ پێویستە کە ئارەزویەکت هەبێت لەو ئارەزوانە کە تاوەکو لەکاتی نارەحەتی وغەم وبێزارەدا پەنای بۆ بەریت و دیومانە و بیستومانە کە چەندین کەس ئارەزووەکانیان لە دارمان و ڕوخان ڕزگاری کردوون .

یەکێك لە ڕانەی کە ئەزموونیان هەبووە بەشێکی زۆری ژیانیان بەسەر بردووە لە پێناوی گەڕان بەدوای بەختەوەریدا کە خەڵکی لەسەری ڕاهاتوون وە وای لێ کردوون کە باوەڕیان بەوەبێ کە ئەم بەختەوەرییە شتێکە هیچ بوونێکی نییە وە ئەو بەختەوەرییە بۆ هەموو کەسێکیش نۆرە وەهەڵناکەوێت ، وەدەڵێن " بەختەوەری وەکو جوانی وایە خودی خۆیەتی بنەمای بوونی وهۆکاری بونیشی ... وە لەتوانای هەموو مرۆڤێکدایە کە دەستی بۆ درێژ بکات تاوەکو ئەوەندەی کە پێویستێتی بۆتەو کاتەی کە ئارەزوی دەکات وەیەوێ باڵی بەرێت .

پاشان وتی : ڕۆژێکیان چوم بۆ سەردانی خێزانێك کە پێکهاتبوون لە دایك باوك وپێنج منداڵ وە بە توندو تۆڵی وپێکبەستنەوەیەکی توندی خێزانی و خۆشەویستی و لێك تێگەیشتن لە نێو هەموو ئەندامەکانیاندا ناوبانگیان دەرکردبوو ... تاوەکو ناویان لێنرابوون بەختەوەرترین خێزان لە جیهاندا .

وە ڕۆژی هەینیم دەمەو ئێوارە هەڵبژارد بۆ ئەو سەردانەم چونکە دەمزانی کە تەنها ئەو ڕۆژە هەیە کە ئەوان دەوامیان نەبێت و لەماڵ بن ، کاتێك کە چوومە نێو ماڵەکەوە سەلامم لێ کردن .. لەچەند شوێنێکەوە وەڵامی سەلامەکەم بیستەوە .. لەوکاتەدا باوکیان سەرقاڵی هەڵگرتنی کورسی یەکی دێرین بوو وە خۆی پێوە خەریك کردبوو .. وە دایکیان لەسەر کورسییەك دانیشتبوو لە سەر باڵەکۆنەی دەرەوە سەری بەرەو



ئاسمان بووە وەکو ئەوە وابوو کە ئەستێرە بژمێرێت ، وە منداڵەکانیشیان هەریەکەیان سەرقاڵی شتێك بوو وە ئەوە بوو هەموویان بەسەر ڕاوشان وخەندەوە پێشوازیان لێ کردم وپاشان هەموویان خەریکی کاری خۆیان بونەوە ، منیش چوومە لای باوکیان ودیقەتم دا کەچۆن وا بە پەرۆشەوە خەریکی کاری خۆیەتی و لە نێوانماندا ئەم گفتوگۆیە ڕوویدا :

وتم من بۆیە ئەم ڕۆژەم هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی سەردانتان بکەم چونکە دەمزانی ڕۆژانی تر سەقاڵی کارن .

وتی : زۆرباشە بەڵام ئەمڕۆش لای ئێمە یەکێکە لەڕۆژە گرنگەکان نەك لەبەر ئەوەی کە پشوی ڕەسمیمانە خۆمانی تێدا بخەینە ئەوپەڕی تەمەڵی و خۆتوندکردمان لە جێگاکانماندا .. وەك دەبینیت تۆ بەم سەردانەت ئێمەت شەرەفمەندکرد بەڵام هیچ کاممان نابینیت بێکار دانیشتبێ بەڵکو هەریەکەمان خەریکی کار وئارەزوی خۆمانین وە ئێمە ئەم ڕۆژە ناودەبەین بە ( ڕۆژی بەختەوەری ) کەتێیدا بەهۆی چێژوەرگرتنمان لە ئارەزووەکانمانەوە بەشێکی زۆر بەختەوەری وەردەگرین ، وە ئێمە خێزانێکی زۆر دڵخۆش ووابەستەی یەکترین ، دیارە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەروەردەیەی ئەو بنەماڵەیە کەچۆن لە منداڵیەوە لەسەری پەروەردە کراون ، کە لێرەدا پەروەردە کردن ڕۆڵێکی مەزنی هەیە بۆ خۆش خۆشگوزەرانی و بەختەوەری خێزان ، گەر ئەوخێزانە خاوەن پەروەردە ورەوشتی جوان نەبن چۆن ئاوا لەناو یەکدا دۆست وخۆشەویستی یەکتر دەبن و کۆمەکی یەکتر دەکەن ، دیارە ئەو دایك وباوکە هەمیشە هانی منداڵەکانیان داوە کە هەر یەکەیان خۆی بە ئارەزوویەکی شەریفەوە خەریك بکات و تا ببێتە بەشێك لەژیانیان بەمەش دیارە هیچ کامیان ڕووبەڕووی نارەحەتی و دان تێژکردنەوە لەیەکتر نابنەوە و بەمەش بێ گومان دەتوانی خێزانێکی ئاوا بەختەوەر پێك بهێنێت و ببێتە نموونەی جوانی وباشی و کۆکی ناو خێزانەکەت .

بێ گومان پەروەردەکردنی خێزانیش پێویستی بە چەندین بنەما هەیە بۆ برە وپێدان وڕێکخەونانی لەسەر ئاستێکی شیاو و جوان و بەڕەوشت ، جا یەکێك لەو بنەمایانە ئەوەیە کە چۆن هەر لەسەرتاوە ڕێز وخۆشەویستی وبەدەنەگەوەهاتن بڕوێنێتە ناو ڕۆحی ئەندامانی ئەو خێزانە ، وە کارێکی وابکەیت تا بتوانی وا لە تاکەکانی ئەو خێزانەت بکەی کە هەریەکەیان بەپێی ئارەزووی خۆی بڕیار بدات لەسەر هەڵبژاردنی ئارەزوویەك کە ئەمەیان باسەکەی منە کە دەڵێم ئارەزوو وا لەمرۆڤ دەکات کە هەندێ جار لە کاتی نارەحەتی و دڵتەنگیدا ئەو ئارەزووەی کە هەتە گەر بتوانی خۆتی پێوە خەریك بکەیت لەوانەیە زۆر بەسانایی بتوانیت بەسەر کۆسپ وغەمەکانتا زاڵبیت ، بەمەش خێزانێکی نموونەیی پەروەردە دەکەیت .

خوێنەران ئەم کورتە باسەی من تەنها ئەوەندەیە کە بۆ ئەوەی خێزانێکی بەختەوەر دروست بکەیت دەبێت سەرەتا لە پەروەردەکردنیانەوە دەست پێ بکەیت واتە هەموو بنەمایەکی خۆشگوزەرانی خێزان دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەی سەرتایی ئەو خێزانە .




# دادپەروەری کۆمەڵ وئازادی فەرهەنگ لە کۆمەڵ دا

نوسینی فاروق عەبدول عەزیز

شارەزای دەروون ناسی وکۆمەڵ

ئینسان خوازیاری دادپەروەری وئازادیە ،کاتێك دادپەروەری کۆمەلاتی چەسپا ئازادی سەقام دەگرێت ، دادپەروەری لەگەڵ ئازادی‌دا گرێ بەستن واتە کاتێك داد پەروەری پێشێل کرا ئازادی بەند دەکرێت ودەتوانین بلێین لەهەرکۆمەڵگەیەك ئازادی ببێت ئەوا دادپەروەریش هەیە ، ئەویە ئازادی ودادپەروەری تەواوکەری یەکترین .

ئینسان لەچەشنی گشتی دا نێر و مێ پێك هاتووە کە هەرکامێك لەمانەش تایبەتمەندی ومافی خۆی هەیە .

هەروەها کە دوومرۆڤ نابینین لەچەشن و قەبارەی خۆیدا وەکو یەك بن وجیاوازی تەواویان هەیە (هەتا دووانە یەکسانەکان کەلە تۆوێك و هێلکەیەك بەدی هاتوون لەگەڵ یەکتردا جیاوازیان هەیە چ بگاتە دووانە نایەکسانەکان وباقی مرۆڤەکان ([1]) ، ئەش شۆرشی زانای فەرەنسی (ژان ژاك رۆسۆ) لەکتێبی گرێ بەستی کۆمەلایەتیدا [2] ئاماژەی پێکردووە سەبارەت بەجیاوازیەکانی تاکەکەس هەروەها بۆ مارەیی و شوێندار و هەندێکی ڕەچاو کراو: لەجیاوازییەکانی ئینسانەکان بەیەکەوە .

کۆمەڵیش کەلە کوێ تاکە جیارازکان پێك هاتووە بەرهەمەکانی و بەدیهاتووەکانی بۆ تاك وکۆجیاوازە بەلام بەپێی نیاز و پێویست فەرهەنگی بۆ هاربەشی دامەزراندوە کەفەرهەنگ بریتیە لەکوێ فۆلکلۆروکەلتور و داب ونەریت وبیر و بۆچوون و بروا جیهان بینی و زمانی هاوبەش بۆپێکەوە کۆکردنی گەل بەوتەیەکی تر هەرگەلێك فەرهەنگی گشتی ولەنێوان ئەودا وردە فەرهەنگەکانیشی (Sub-Culcher)هەیە . [2] ئەندامانی کۆمەڵگە بە هۆی زمانەوە لەگەڵ یەکتریدا پەیوەندیان هەیە ، زمانیش بەسمبولی فەرهەنگ دانراوە بۆ ووتار و نووسین و خوێندنەوە .

هەروەها زوڵم وستەمی هەمەلایەنەیان لەگەلی کورد کردوە ئەوەتە کتێبخانەگشتیەکان لەخەزنی کتێبە کوردیە زانستیەکان زۆرلاواز و هەژارن واتە لەخوێندنگاکانی ئاینی وباقی خوێندنگان و زانکۆکانمان کە تەمەنیان بۆ سی وچل ساڵ دەروات بایەخی ئەوتۆ کەشایانی‌ئەم گەلە کۆڵ نەدەرە خەباتکارە بێت نەدراوە هۆکەیشی تەسك بینی دوژمنانی غەدارە .

بەهۆی نەبونی کتێبە سەچاوەکان وئینسکلۆپیدیای زانستی کوردی پاش راپەرینی پەڵز و کۆڕەو کە ١٢سال تێ‌دەپەرێت نابینرێت بەباشی ئەم کەلێنە پرکرێتەوە ئەمەش دەمەوێت لەم بەشەدا گرنگی دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەکانی کوردستان لەکتێبە کوردیە سەرچاوە زانستیەکان پێویستی‌یەکی زەرورە . هەروەها کمپێوستە ئێمە زمانە بیانیەکان بەباشی فێربین و بەپێش کەوتنی ئەوان خۆمانی پێ دەوڵەمەندی زانستی بکەین هەروەها زمانی کوردیش کە سمبولی فەرهەنگی کوردیە کەهەزاران شەهیدو ئەنفال کراو و بێ سەرو شوێن کراوی بۆ ئەمە پێشکەش کراوە لەبیر نەکەین .

هەرواکەئاماژەی پێ کرا زمان سیمبولی فەرهەنگە و فێربوونی زمانە تێر وتەواوەکانی گەلانی تر زۆرچاکە بۆ ئەوەی زانست و زانیاری زیادتریان لێ وەرگیرێت ڕێوێستێکی سەردەمە بۆ پەیوەندیەکان ، هەرواش گرنگی بەزمانی کوردی خۆمان ودەوڵەمەندکردنی پێویستە بۆ ئەمە ئەرکە گەورەکان دەکەوێتە سەرشانی مامۆستایانی بەرێز و خوێندکارە ئازیزەکانی زانکۆ ، دەزانین دەست پێ کردنی هەرکارێك لەپێش دا هەندێك گرانە بەلام لەشۆڕش دا هەمیشە دەبێت لەخۆبووردوویی هەبێت وەستان و کۆڵ نەدان لەسەر گەیشتن بەئامانج یەکێك لەو ڕێگایانە کە من پێشهاتی دەکەم ئەوەیە :

دیارە مامۆستایانی بەرێزی هەربەشێکی زانستی سەرچاوەیەك بۆ وانە تایبەتیەکەی دادەنێت جاباش وایە وەکو کارێکی عەمەلی بەهەرقوتابییەك یان چەند خوێنکارێك بەشێك لەوانە بۆ وەرگێران بەزمانی کوردی بدرێت جاخوێندکارەکان کارەکانی یەکتری هەڵسەنگێنن وهەڵەکانی چاك کەن ئەم کارە دەبێتە باش فێربوونی ئەوزانستە ولەئاخردا ئێمە وەرگێراوی کیتی دانەیەکمان بەکوردی هەیە کەپاش پیاچونەوە دەتوانرێت لەچاپخانەی زانکۆ لەچاپ بدرێت بۆ جیلی داهاتوو و زانست خوازانی گەل کەنەتوانن بەزمانی بیانی بخوێننەوە دەبینین لەساڵێکدا چەندکتێبی وەرگێراو کتێبخانەکانی دەوڵەمەندکرد و ئاستی زانستی کۆمەلگەی سەرخست و بواری بۆمامۆستا و خوێندکاری داهاتوو ڕەخسان سەرچاوەیەکی تازە و زانستی زۆرتر وەرگرن !

(( دەگێرنەوە پاشایەك لەگەڵ هاوڕێکانی‌دا بەرێگەیەکدا دەڕۆیشتن پیرە پیاوێکی بینی لەتەمەندا خەریکی ناشتنی نەمامی گوێز بوو لەوسەردەمە گوێز بەدرەنگی دەهاتە بەر، پاشا ووتی : های لەم خاڵەیە ئەوە خەریکی چیت ؟ ووتی پاشا نەمام دەنێژم ! پاشاووتی دەزانم بەلام ئەم دارە درەنگ دێتە بەر ، پیاوی پیر ووتی قوربان دەزانم !خەلکی پێش ئێمە چاندیان و ناشتیان وئێمە لەبەرەکەیان خوارد ئێمەش دەیچێنین ئاداهاتووەکان بەرەکەی بخۆن !)) .

زۆر ڕونە دامەزراندنی رۆشنبیری و فەرهەنگی گەشاو و چاك و باش کردن بەئامانج ودانانی پلان ونەخشە وبەرنامەی هەمەلایەنانەیە دەبێتە شۆرشی رۆشنبیری و فەرهەنگی شایانی مرۆڤ ، ئەویش کە مادەیەکی پاککەرەوەیە ئەگەر لەشوێنێکدا بڕوستی دەگەنێت وبڕدەبێت لەمشەخۆرەکان وبەکتریا و ...... هتد ، ئینسان ئەگەردرو رۆژی وەکو یەك یەکسان بێت خەساری کردووە هەمیشە دەبێت لە خەبات و تێکۆشان بۆ زانیاری زیاتروچاك و باش بوون هەنگاو هەلگرین .

لەئامێرەکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندیەکان بۆدەوڵەمەندکردن وگەشەکردنی کۆمەڵگە سوود وەرگرێت ، زانستەکان بەشێوازی زانستی ئەرك رمافەکان دیاری بکرێت لێزانانە کارەکان بەدەستی کارزانەوە بسپێرێت بناغەی کۆمەڵی داهاتوو راست وبەقوەت دانرێت ڕوونە کەباری لار ناگاتە ئامانج وبینای سستە وبی زوو دەروخێت !

رۆڵی رادیۆ و تەلەفیزۆن و رۆژنامەکان و میدیا و ئامێرەکانی راگەیاندن و پەیوەندی گرنگە چونکە ئەمانە ئەگەر باش و وزانستیانەی بەکاربێن دەتوانن وەکو مەلبەندێکی زانکۆیی ئاستی رۆشنبیری و فەرهەنگی کۆمەلگەیی بەرز بکەنەوە بەپێچەوانەوە دەتوانن بی روخێنن !

جاچۆنیەتی بەکارهێنانی شارەزایانانە لەتەواوی بوارەکاندا گرنگن دەتوانم بلێم ڕیکلام ونواندن بەجۆری وێنە کاریگەری زۆری لە بینەردا هەیە ، بەچاو بینین و بەگوێ بیستن جیاوازیان هەیە ئەمەیە دەنگ وڕەنگ دەتوانێت کاریگەری باشتری هەبێت .

**بۆ پێشەوە بەرەو کۆمەلگەیەکی رێك وپێك**

سەرچاوەکان

عدالت اجتماعی – خسرو شاهی

روان شناسی زمان ل مان – د. شناسی

زمینه جامعه شناسی – د. آریانپور

قرارداد اجتماعی – روسو

---

[1] روانشناسی عمری ژمان ل مان – دشناعی

(٢) قرار دادجاعی روسو

[2] زمینه جامعەشناسی داریان پور



# کورد و مافی چارەی خۆنووسین



عەبدونازی مەلا ئەحمەد
Ahmadawai@ maktoob . com

## ١ - چەمکی مافی چارەی خۆنووسین

بۆیەکەم جار لەسەردەمی شۆڕشەکانی فەرنساو ئەمریکادا واژەی مافی چارەی خۆتووسین بەکار هات ، ئەم واژەیە لەو بەڵگە نامانەدا کە لە " ٢٣ ی نیسانی ١٧٩٥ " دا خرنە بەردەم کوتفرانسەوە و مۆرکرا ، بەتێر وتەسەل تر بەکار هێنرا ، ئەگەر چی پێش وەخت ئەم پرنسیپە لە بەڵگە نامەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکا دا پێناسەیەکی مەنهەجی هەبووە ، بەڵام ئەم چەمکە لە سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەمدا و دوای ئەو جەنگە ، کاتێك پەیمان وڕێکەوتن نامە نێو دەوڵەتیەکان دانیان بەپرەنسیپی نەتەوەکان دا نا بایەخێکی زۆرتری بەدەست هێنا ، لەو ساڵانەدا لینین وویلسن وودرۆ ی سەرۆکی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە دژی یەکتر بوون ، هەوڵێکی زۆریان دا رۆڵێك بۆ پێشخستنی ئەم چەمکە بنوێنن لینین لە بەڵگە نامەیەکی ساڵی " ١٩١٦ " دا دەڵێت :( پێویستە لەسەر سۆسیالیستەکان دەست بەجێ و بەبێ هیچ قەید وشەرتێك بانگەشە بۆ سەربەخۆیی گەلانی ژێر دەست بکەن ) لە بەیاننامەی ( ٨) ی تشرینی دووەمی ١٩١٧ ی ئاشتیش پێی لەسەر ( رزگار کردنی هەموو ولاتە داگیر کراوەکان و سەربەخۆیی تەواوی لەژێر دەستی وزاسەر بەخۆکان ) داگرت ، ئەمەش بەمەرجێکی بنەرەتی بەدیهێنانی ئاشتی دانا ، جارێکی تر لە کانوونی دووەمی ١٩١٨ دا لەراگەیاندنی مافی گەلان و کرێکاران و چەوساوەکان دا جەخت لەسەر ئەم پرەنسیپە کرایەوە .

هەرچی ( وێلسن ) یش بوو ، ڕای بەو جۆرە بوو کە لە نامەیەکیدا کە لەساڵی(١٩١٨ ) نووسیویەتی بۆ کوتگرێس ، بەم جۆرە پرەنسیپە سەرەکیەکەی دارشتووە : ( ئەو پرنسیپە سەرکیەی کە لەم جەنگەدا بۆی تێکۆشاووین ، ئەوەیە کەهیچ حکومەتێك مافی داگیر کردنی خاکی گەلانی تر وسەپاندنی هاوپەیمانێتی سیاسی خۆی نەبێت ) هەروەها ڕای وا بوو کە ( پێویستە لەسەر هێزە ئیمزاکەرەکانی پرۆژەکە ، بەبێ سڵەمینەوە ئەوە پەسەند بکەن ، کە ئەو پرەنسیپەی ئاشتی بەر قەرار کرد ) واتە پرەنسیپی مافی چارەی خۆتووسین بۆ مەسەلە یاسایی وسیاسی وسنووری یەکانی جیهان مەسەلەیەکی بنچینەیی و گرنگە .

وە لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمیش ڕێگە خۆشکرا بۆ مافی چارەی خۆتووسینی نیشتمانەکان ڕەبەختی لەسەر کرایەوە و کاری بۆکرا ، لەماوەی نێوان هەردوو جەنگیشدا مافی چارەی خۆ نووسین وەك مافێك سەلێنرا کە دەبوایە بۆ هەموو ئەو گەلانە بێت کە :

١- کە میندن یاخود زۆرینەن لە دەوڵەتێکدا بەڵام گەلێکی تر حوکمیان دەکات .

٢- کەمینەن لەچەند دەوڵەتێکدا بەبێ ئەوەی دەوڵەتی تایبەتی خۆیان هەبێت .

٣- کە میندن لە دەوڵەتێکدا بەڵام خۆیان بە بەشێکی دەوڵەتێکی دراوسێ دەزانن .

٤- زۆرینەن یاخود کەمینەن لەسەر خاکێکی دیاری کراوی خاوەن دەستورێکی تایبەتدا بەڵام لەژێر کونترۆڵی بێگانەدان .

٥- گەلێکی دابەشکراون لەلایەن هێزی بیانییەوە ناچار کراون لە چەند دەوڵەتێکدا بژین لەم سەر وبەندەشدا دەشێت مافی چارەی خۆتووسین چەند شێوەیەك بەخۆیەوە بگرێت وەك پاراستنی نێودەوڵەتی کەمینەکان ، ئوتۆتۆمی ئیتلیمی ،ئوتۆتۆمی بەشێوە فنوارەیەك لە

چوارچێوەی دەوڵەتێکی فیدراڵ ، یان لەچوار چێوەی دەوڵەتانی ــ بۆ نموونە ــ کۆمینوێلس ، یان لە ڕێی سەربەخۆی نیشتمانیەوە .

بەم جۆرە وپاش برانەوەی جەنگی دووەمـــی جیـــهانیش ، ودوای چەسپاندنی ئەو بنەما و دەستورانەی کە بەرنامەی نەتـەوە یـەکگرتووەکان لە پێناویدا دامەزرا ، ئـەم هـەنگاوە ئاماژەیــەك بـــوو بـــۆ ســـەرەتای دەسپێکی دوا قۆناغی پەرەسـەندنی چەمکی مافی چارەی خۆنووسین .

بـەم شـێوازە بـە پشـت بەسـتن بەبەرنامــەی نەتەوەیـــەکگرتووەکان جارنامەی جیـهانی سـاڵی " ١٩٤٨ " ی مـــافی مـــرۆڤ ، کۆمەڵـــە بڕیارەکـــانی کۆمەڵـــەی گشـــتی نەتەوەیـەکگرتووەکان ، بەتایبـەتی بڕیاری ژمــارە " ١٥١٤ " ی خـولی ١٥ ڕۆژی " ١٤ ی کـــــانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٦٠ " سـەبارەت بەسەربەخۆیی گـەلانی کۆلۆنیـالی و بڕیاری ژمــارە " ١٨٠٣ " ی خـولی " ١٧ ی ڕۆژی ١٤ی کـــــانوونی دووەمـــی سـاڵی ١٩٦٢ ســـەبارەت بەمافی گەلان لە سوود وەرگرتن لــە سـەروەت وسـامانی سروشـتی یـان مــافی چـارەی خۆنووســـین بـــەرز نرخێـــنرا و وەك مـــافێکی پـــیرۆز تەماشاکرا ، جگە لەوەیش ئەم مافە لەیەکـەم خـاڵی هاوبەشـی هـەردوو پەیمانــە نێــو دەوڵەتیەکــەی مافــە شارســـتانی ، سیاســـی، ئـــابووری ، کۆمەلایەتی و کەلتوری یە کانی ساڵی " ١٩٦٦ " یش ئاماژەی پێکرا ، هەروا لـە بەیاننامـەی پەیوەندی دۆستانەی ساڵی " ١٩٧٠ " ی نێوان گەلان ، خاڵی چوارەمی بـەندی یەکـەمی یەکـەم پرۆتۆکۆلی سـاڵی " ١٩٧٧ " ی یاسـاکانی جەنگـە نێـو دەوڵەتیـەکان ، دوا ڕاسـپاردەکانی کۆنفرانسی هیلسنکی و جارنامەی جیهانی مافی گەلان .

## ٢- مافی چارەی خۆنووسین وگەلی کورد

ڕێزگرتن لە مافی چارەی خۆنووسینی گەلان دەچێتە خانەی مافەکانی ( OMNES ERGA ) کەچی شرۆڤەیەکی بەرنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان کە مافی چارەی خۆنووسین تەنها بـۆ گـەلانی ژێر کۆنـتڕۆڵی کۆلۆنیـالیزم یـان بێگانە دەسەلێنێ ، شـرۆڤەیەکی تەنگبینـە و ئـەمڕۆ یاسـای نێـو دەوڵـەتی هاوچـەرخ تـا ڕادەیـەك بەیەکجارەکی فەرامۆش کردووە ، لە لایەکی ترەوە شرۆڤە وتەفسیری بـەو جـۆرە بـەهیچ شـێوەیەك لـە دەقـی خاڵـەکانی (٢ ـ ١ـ ٥٥)ی بەرنامەکەدا نیە .

چونکە ئەم دوخاڵە باسی گەلان دەکەن بەبێ جیـاوازی ، پەسـەند کردنـی ئـەم تەفسـیرە ڕەنگـە بەمانای فەرمۆشکردنی مافی چارەی خۆنووسینی گەلان بێ پاش ڕزگار بوون لـە کۆلۆنیـالیزم و دەسەلاتی بێگانە ، گومان لەوەدا نییە کە چاکتر بووە پێش هـەموو شـتێك ئـەوە نـەهێلدرێ کـە هەندێ دەوڵەت و گەل بچن هەندێ ولات وگەلی تر داگیر وکۆنترۆڵ بکەن .

ئەوەی ڕاستیش بێت کاکڵەی بەرنامەکەی نەتەوە یـەکگرتووەکان مۆرکێکـی بـاوك سـالارانەی دەوڵەتی پێشکەوتووەکانی بەرامبەر بەو گەلانە پێوە دیارە ، کەوا تەماشاکراون کە ناتوانن خۆیان حوکمی خۆیان بکەن .

لـە سـۆنگەی ئەمـەوە دوو خاڵەکـەی ( ٧٣ و ٧٦ ) ی بەیاننامـەی نەتەوەیـەکگرتووەکان لێپسراوێتی هەڵسوراندنی زەمینـە نـا سـەربەخۆکان و ماندێتکراوەکـانی بەدەوڵەتـە ئەندامـەکان سپاردووە بۆ ئەوە ئەو گەلانە بەرەو سەربەخۆیی تەواو و پەیڕەوکردنی مافی چارەی خۆنووسین بەرن ، سەرباری ناوەڕۆکی پەیماننامەکە ، کۆمەڵەی گشتی چەند بڕیار وبەڵگە نامەیەکی تری هەیە کە دوا لە دەزگـا جیاوازەکـانی کۆمەڵـەی گشـتی وئاژانسـە تایبەتیـەکانی کاردەکـەن ، ئـەو مافانـە پەرەپێدەن و لەهەموو جیهاندا بانگەشەیان بۆ بکەن .

ساڵی ( ١٩٦٦ ) نەتەوە یەکگرتووەکان دوو پەیمانی نێودەوڵەتی پەسەند کرد ، کە لـە سـاڵی ( ١٩٧٦ ) دا هەموو دەوڵەتەکان پێوەی پابەندبوون ، ئەم دوو پەیمانە زادەی بڕیاری ژمارە



٧١ ـ ٥٤٥ " ی رۆژی(٥ی شــوباتی ١٩٥٢ ) ی کۆمەڵـەی گشــتی بــوون و ڕیتی بوون لە پەیمانی نێودەوڵەتی مافە ئابووری و کۆمەلایەتی و کلتوورییەکان .

لە خــاڵی یەکـەمی هـەردوو پـەیماندا مــافی چــارەی خۆنووســین ســیمایەکی جیهانی هەیە و لـە هـەر دووکیـاندا بـەم جۆرە گوزارشتی لێکراوە :

١- هــەموو گــەلان مــافی چــارەی خۆنووسینیان هەیە ، بەم پێیە گەلان بـە شـێوەیەکی ئـازاد چۆنیـەتی پێکـهێنانی ڕژێمـی سیاسـی خۆیــان و بــەم پێــوە دانگەش چۆنیەتی گەشەکردنی ئابووری ، کۆمەلایـەتی و کلتـوری خۆیــان دیــاری دەکەن .

٢- بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانیان ، هەموو گەلان ، بە بەبێ هیــچ بڕیـارێکی پێش وەخت و بەبێ ئەوەی ڕێکخراوەکانی هاریکاری ئـابووری نێـو دەوڵـەتان و هیچ پابەند بوونێکیان بەسەردا بسەپێنن ، بەپشت بەستن بە پرەنسیپەکانی ئاشتی ویاسای نێو دەوڵەتان ، دەتوانـن ئازادانـە کـەلك لـە سـەروەت وسـامانی سروشـتی خۆیان وەر بگرن ، هیــچ هــەلو مــەرجێك ڕێ نـادات گـەلێك لەکۆمـەك ویارمــەتی بێبەش بکرێت .

٣- [illegible] ئەندامەکانی ئەم پەیمانـە ئەوانەی [illegible] پرســیارن لـە بـەڕێوە بردنـی زەمینــــی ناســـر بـــەخۆ و زەمینـــــی بەوەکالەت . بەڕێوە بـراو دەبێـت بـەپێی گەوهـەری بەرنامــــەی " UN " بــۆ جێبەجێکردنی مـافی چارەی خۆنووسین و ڕێزلێنان لەو مافانە کار بکەن .

هەروەها بڕیاری ژمارە ( ٢٦٢٥ ) ی رۆژی " ١٠ ی تشرینی یەکەمی سـاڵی ١٩٧٠ی " کۆمەڵەی گشتی گرنگیەکی زۆری هەیە ، کە تیادا هاتووە ( مـافی چـارەی خۆنووسـین بـۆ هەموو گەلانەو لە سەر هەمووان پێویستە ڕێزی لێ بگرن ) ، هەروەها لە بەیاننامەی کۆتایی کۆنفرانسـی هێلسـنکی پایەدارانـە لـە سـاڵی " ١٩٧٥ " دا پشـتیوانی لـە مـافی چــارەی خۆنووسین کراوە ، هەروەها لە سەدان ڕێکەوتن و دانیشتن و کۆنفرانسـی تـردا پشـتیوانی لێ کراوە .

بەم جۆرە بۆ هەمووگەلان لەسەر ئاستی جیهاندا مــافی وجـودو مـافی سـود وەرگرتنـی ئازادانە لەداهاتەکانی سروشت و مافی چارە ی خۆنوسین سەلمێنراوە .

بۆیە ڕزگاربوون لە کۆلۆنیالیزم وداگیرکەری بێگانـە هـەنگاوی یەکەمـە بـۆ بەدیهاێنانی ئازادی بنەڕەتی مرۆڤ ، لەبەرئەوە مانای مافی چارەی خۆنوسین لەمافە سەربەخۆیی فراوانترو بەرینترە ، واتە جێ بەجێ کردنی مافـە بنەڕەتیـەرزیی یـەکان دەبێتـە هۆیـەك بـۆ مسـۆگەر کردنی مافی چارەی خۆنوسین بەهەردوو شێوە دەرەکی وناوەکی و خۆیی یەکەی ، هـەرچۆنێك بێت ، هەندێ گەل هەن کە لە هەندێ قۆناغی مێژوویدا بـە دەوڵەتێکـەوە لکێـنراون ،(چ ئـەو دەوڵەتە پێش لکاندنەکە هەبوبێت یان تازە دامەزرابێت) لەئەنجامی ئەمەدا ئەم گەلانە مافی چارەی خۆنوسین ناوەکی ودەرەکیان لەدەست دا .

هەرکات ئەوگەلانە ویسـتبێتیان پـەیڕەوی لـەمافی چارەی خۆنوسـینی خۆیـان بکـەن ، کە ئەد و لەسەرپان هاتۆتەپێش نەیان توانیوە ویسـتی خۆیـان جـێ بـەجێ بکـەن ولەلایـەکی ترەوە ئەوەشیان لێ قوت بۆتەوە کەدەبێت ڕێزی سەروەری ئەو دەوڵە تانە بگرن .

لەدۆخی ئاوەهادا پێویستە لەسەرکۆمەڵی نێودەوڵەتان ، بۆ ڕێـز گرتـن لەیاسـاکانی UN ی تایبەت بەمافی چارەنوسی گەلان ، پەرە بەچالاکی ومیکانیزمەکانی خۆی بدات ، چونکە مافی چارەی خۆنوسین تەنها لەلایـەن یاسـای هاوچـەرخی دەوڵەتانـەوە دانـی پیـادا نـەنراوە ، بەڵکو جێ بەجێ کردنی دەبێتـە ئـامرازێکی بنـەڕەتی بۆئاسـایش و ئاشـتی جیـهان و بـەدی هێنانی ئەو ئامانجانەی کەڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیان بۆ دامەزراوە.

## ٣-فۆرسانی نێودەوڵەتی گەلی کورد

وەك ئاشکرایە گەلی کورد کەمینەیەکی دینی یـان زمـانی یـان کـەلتوری نییـە؟ بـەڵکو گەلێکی تەواوە ژمارەی دانیشتوانی لە(سی ملێۆن کەس زیاد تـرە ) نیشـتیمانەکەی نـاوی کوردستانە و ڕوبەرەکەی دەورووبەری (٥٠٠هەزار کیلۆمەتر ی دوجادەبێت) .

واتە : بەقەدەر سەرجەمی ڕوبەری ئەڵمانیا ، نەمسا سویسرا یە ولەپەیمانی سـاڵی(١٩٢٠ ی سیڤەر ) یش مـافی دامـەزراندی دەوڵەتێکی سەربەخۆی بۆ سەلمێنراوە .

لەسیمینارێکی ساڵی ١٩٨٩ ی ڕێکخراوی یونسکۆ لەپاریس بۆقـوڵ بونـەوە لەچـەمکی مافی گەلان . بەمجۆرە (گەل) پێناسەکەی:

١-کۆمەڵە خەلکانێکە هەندێ یاخود هەموو ئەم خاسیەتە هاوبەشانەیان هەیە

أ- داب ونەریتی میژوویی هاوبەش

ب- ناسنامەی نەتەوەیی یان ئیتنیکی

ج- یەك کەلتور یان کەلتورێکی لێك چوو

د- ناسنامەی زمان

ه- دین وئایدۆلۆژیایەکی لێك نزیك

و- پەیوەندی جوگرافیایی

س- ژیانی ئابوری هاوبەش

٢-بەبێ گوێدانە ژمارەی کۆمەلە خەلکە لە(وەك گەلانی دەولەتە بچوکەکان ) دەبێت خەلکەکە لەناوخۆی دەولە تێکدا زیاد لەڕێکخراوێکی ساکاریان هەبێت .

٣-پێویستە لەسەر کۆمەلە خەلکەکە داوای ئەوەبکەن کەبەگەل بژمێردرێن یاخود ئەوهەستەیان هەبێت کەتێکڕایان گەل پێك دێنن .

به ڕەچاوو کردنی ئەوەی کە لە نێو ئەم گروپانەدا خەلکانێك هەن کەهەمان خاسیەتی سەرەوەیان تیاداهەلگرتووە ، بەلام ئەویستی گەل یان هەیە و نە هەست .

٤- پێوسیتە کۆمەلە خەلکەکە بۆ بەرچاو خستنی خاسیەتە هاوبەشەکان ودەرخستنی ناسنامەی هاوبەش ڕێکخراوو دەزگای‌تریان هەبێت .

بەلام ئایا ئەو گەلانە کێن ؟ کە ئەو پەیمان نامەیە ئاماژەیان بۆ دەکات .ئەگەر ئەوە تەنها ئەوگەلانە بگرێتەوە کە سەربەخۆیی یان بەدەست هێناوە و سەرجەمی گەلان نەگرتتەوە . بڕیارە پێشینەکانی UN دوچاری ئاکۆکی دێن .ئەویش لەو ڕوانگەیەوە ، کە UN پشتیوانی لەو سەربەخۆیی یە کردووە . کەئەو گەلانە خەباتیان بۆ کردووە ، ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە ئەگەر مەسەلەکە هەرگەلە سەربەخۆکان بگرێتەوە .خۆمان لەسەنگەرێکدا دەدۆزینەوە لەدژی ئامانجەکانی UN ، واتە پاراستنی ئاشتی‌جیهان کەشتێکە تەنها بەسەلماندنی مافی یەکسانی ی تەواوی گەلان دەستەبەردەبێت .

لەسۆنگەی ئەمەوەپێویستە زاراوەی (گەل) هەموو گەلان بگرێتەوە ، بەبێ گوێ دانە ئەوەی کەئەو گەلانە سەرخۆن یان نا، بەواتایەکی تر ، ئەو گەلانە بەگەل نایەنە ئەژمار کەبەزۆر بەدەولەتێکەوە لکێنراون ، وەك لە نمونەی گەلی کورد دا دەکەوێت، ئەمەش هەر لەبەر جولانەوەی رزگاری ئەو گەلانە هێشتا بەئەنجام نەگەیشتووە ، ئایا ئەمە بەو مانایە دێت کە دان نان بەمافی گەلان دا دەوەستێتە سەر بەکارهێنانی هێزو سەرکەوتنی خەباتەکەیان ؟ دیارە ئەم جۆرە تەفسیر و بۆچوونە لەگەل مەنتیق وعەقلدا ناگونجێ .

لەم بارەیەوە لە ڕاپۆرتی یونسکۆدا هاتووە کە گەلان مولزەم نین ئەو ڕژێمانە قبول بکەن کە مافە بنەڕەتیەکانی کسان و گەلان ناسەلمێنن ، لەبەر ئەوە سەیر نی یە کاتێك شارەزاکان مەسەلەی گەلی باشوری ئەفریقا ، فەلەستین و کوردستان لە گفتوگۆکانیاندا بەنمونە بهێننەوە

جگە لەمانەش بەلگە نامەیەکی گرنگی تر هەیە ، کەدان بەفورسایی نێودەولەتی گەلاندا دەنێت ، ئەویش پەیمان نامەی ئەفریقایی مافەکانی مرۆڤ و گەلانە کە لەسالی " ١٩٨٦ " دوە دەولەتە مۆر کەرەکانی پێوەی پابەندن ، ئەم ڕێکەوتن نامەیە بەلگە نامەیەکی یاسایی کیشوەرییە .

بەندەکانیش هەم مافەکانی گەلان دەسەلمێنن و هەم دەولەتان بەڕێزلێنان پابەند دەکەن ، دەولەتە ئەندامەکانی ڕێکخراوی یەکگرتنی ئەفریقا لەڕێی ئەم پەیمان نامەوە نەك هەر پێیان لەسەر مافی چارەی خوتووسینی سیاسی وئابوری گەلان داگرت بەلکو لە خالی ( ٢٠ ) پرەنسیپی یەکسانی گەلان و خالی ( ١٩ ) و مافی بوونی گەلان خالی ( ٢٢ ) و مافی سوود وەرگرتنی ئازاد لەسەروەت وسامانی سروشتی خالی ( ٢١ ) و مافی ژیانی ئاسوودە لەسەر ئاستی ناوخۆ و لە سەر ئاستی نێو دەولەتاندا خالی ( ٢٣ ) و ژیان بردنە سەریان لەژینگەیەکی ڕێك وپێك سەلماند ، خالی ( ٢٤ ) .

بۆیە گەلی کورد سەرجەم ئەو خاسیەتانەی هەیە ، کەدەبنە مایەی ئەوەی‌کەکۆمەلی نێو دەولەتان بەتایبەتی (UN ) مافی چارەی خوتووسینی بسەلمێنێت ، وەدان بنێت بەفورسایی‌یەکەیدا و حساب بۆ بزاڤە ڕزگاری‌خوازەکەی بکات ، وەك باقی بزوتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی وەك پۆلیساریۆ لە بیابانی ڕۆژئاوا ، سوابۆ لە نامیبیا و ڕێکخراوە رزگاری خوازەکانی فەلەستین ـ، وەدان نان بە مافی چارەنووسی کورد دا ، بۆشایی‌یەکی گەورەی خەباتی گەلی کورد لەسەرئاستی نێو دەولەتی‌دا پڕدەکاتەوە و دەبێتەمایەی بەرگری لەمافە ڕەواکانی و لەمافی چارەی خوتووسین .



## - UN و ڕۆڵی لە سەلماندنی ئەم مافەدا بۆ کورد

نەتەوە یەکگرتووەکان بایەخی بە چەندین کێشە داوە ، کە تارادەیەکی زۆر هەم لە رووی مێژووییەوە لە کێشەی کورد دەچن ، هەم لە ڕوی ڕەوایی نێو دەوڵەتیەوە ، زۆربەی جار لە ئاکامی هەوڵ و تێگەیاندنی UN لە مەسەلەی گەلانی ستەمدیدەدا ، کۆمەڵی نێو دەوڵەتان ئاشنایەتی لەگەڵ کێشەکەدا پەیدا کردووە و کێشەکە ڕەوایی نێو دەوڵەتی بەدەست هێناوە و چەند میکانیزمێکی تایبەتی بۆ پاراستنی ماف و مرۆیی و ئازادیە مەدەنی و سیاسی یەکانی پەیدا کردووە.

بۆنموونە سەبارەت بەمەسەلەی گەلی فەلەستین ، کۆمەڵەی گشتی لە بڕیاری ژمارە ( ٢٥٣٥ ) ی ڕۆژی ١٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٩ دا ڕاگەیاند کە گیرو گرفتی ئاوارە عەرەبەکانی فەلەستین زادەی پێشێلکردنی مافی چارەی خۆنووسینیانە کە بەپێی پەیماننامەی UN و ڕاگەیاندنی جیهانی مافی مرۆڤ هیچ بەدیلێکی نییە ، دواتر لە چەند بڕیارێکی تردا دووبارە کرایەوە .

لەبڕیاری ژمارە ( ٣٢٣٧ ) ی ڕۆژی ٢٢ ی تشرینی دووەمی ١٩٧٤ ی کۆمەڵەی گشتی دا دان بەوەدا نرا کە ڕێکخراوی ئازادی فەلەستین نوێنەری شەرعی گەلی فەلەستینە و بانگهێشت کرا وەك چاودێر بەشدار بێت لە کۆبوونەوەکانی کۆمەڵەی گشتی دا ، دواتر کۆمەڵەی گشتی بە پێی بڕیاری ژمارە " ٣٣٧٦ " ی ڕۆژی ١٠ ی تشرینی دووەمی ١٩٧٥ بڕیاری دا کۆمیتەیەك بۆ پەیڕەوکردنی مافە بنەڕەتیەکانی گەلی فەلەستین دا بمەزرێنێ ، هەروەها دەرکردنی دەیان بڕیار و بەستنی دەیان کۆنفرانسی تایبەت ئەنجام دران بۆ بەدبهێنانی مافی گەلی فەلەستین .

وەیاخود لەسەر کێشەی نامیبیا وبیابانی ڕۆژئاوا ، کەکۆمەڵەی گشتی بەپێی بڕیاری ژمارە " ١٦٥ " ی ڕۆژی ١٤ ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦ دا قسە وبڕیاری پێویستی لەسەر درا و ئەنجومەنی ئاسایشیش تا ڕادەیەك هەموو ساڵ بڕیاری لەو بارەیەوە دەرکرد .

وە بەپێی بڕیاری ژمارە " ٢١٤٥ " ی ڕۆژی ٢٧ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦ نامیبیا خرایە ژێر سەرپەرشتی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە تا ئەو ڕۆژەی سەربەخۆیی بەدەست دێنێ .

سەرئەنجام UN کۆنفرانسێکی نێو نەتەوەیی بۆ سەربەخۆیی بێ سێ ودووی نامیبیا لە ڤیەننا لە ٧ تا ١١ ی تەمموزی ١٩٨٠ ڕێکخست، تییدا بڕیاریکارنامەیەکی‌گشتی درا و بانگەواز بۆ سەربەخۆیی دەست بەجێی نامیبیا بەئیمزای خەڵکانی بەناوبانگی ناو کۆنفرانسەکە بلاّو کرایەوە .

هەروەها ڕۆڵی UN سەبارەت بەکێشەی بیابانی ڕۆژئاوا و مەسەلەکانی تر UN توانیوێتی ڕۆڵی ئەکتیڤی لەسەر کێشەی ئەو ناوچانە هەبێت .

کاتێك دۆخی گەلی کوردیش بەو گەلانە بەراورد دەکەین دەر دەکەوێت کە کوردیش هەموو ئەو مەرجانەی تیادایە کە لەو گەلانەدا هەبووە تا بەمافی چارەی خۆنووسینی خۆیان گەیشتوون ، کەچی UN تا ئێستا هیچ ڕۆڵێکی گرنگی بۆ ئەو مافەی کورد نەدیوە .

بۆیە لەدەر ئەنجامی ئەم بڕگەیەشدا دەردەکەوێت کەگەلی کورد هەموو مەرجە یاسایی وشەرعیە نێو دەوڵەتیەکانی هەیە تامافی چارەی خۆنووسینی بسەلمێنێ و باجی‌ئەو ئەهامەتیەی بۆ بەدرێتەوە کە دەیان ساڵە پێوەی دەناڵێنێت و UN لێی بەر پرسیارە ، وە دەبێت ئەو ڕێکخراوەش بوونی خۆی بسەلمێنێت لە سەلماندنی مافی گەلانی چەوساوەدا .

## ٥- بزاڤی ئازادیخوازی نیشتمانی کورد لەیاسای نێو دەوڵەتاندا

واژەی ( جەنگی رزگاری نیشتمان ) بەر لەوەی‌کە یاسا ڕێکی خستبێ ڕیشەی دەچێتەوە سەر واقیع ومێژوو واتە پێش ئەوەی زاراوەیەکی قانونی بێ گوزارشت لە بارێکی سیاسی ودیاری‌کراو دەکا ، لەیاسای جەنگدا جیاوازییەکی روون لەنێوان جەنگی نێو دەوڵەتی و جەنگی ناوخۆ یاخود لەنێوان جەنگی نێودەوڵەتی وجەنگی نانێودەوڵەتی هەیە ، بەڵام دواتر براندوە جەنگی‌جیهانی دووەم پۆلێنی هەندێ جەنگ گۆڕانی بەسەردا هات ، بەتایبەتی جەنگی دژی کۆلۆنیالیزم ، واتە جەنگی رزگاری ، کە ئەمڕۆ بەهەموو ئاسەوارێکەوە بەجەنگی نێو دەوڵەتی دەژمێردرێ و بەجەنگی ناوخۆیی دانانرێ .

گۆڕانکاریەکانی کەبەسەر مافە مرۆییەکاندا هاتوون هاوتەریب لەگەڵ ئەو هەنگاراندا پێش کەوتوون کە بۆ ساغکردنەوەی مافی چارەی خۆنووسین و پرەنسیپی مافی یەکسانی هەموو گەلان نراون .

دوای جەنگی جیهانی دووەم بەهۆی پەیمانی جیاجیاوە مافی تازە لەم بوارەدا سەری هەڵدا ، ئەم مافانە نەك هەر یاسا کوتەکانیان گۆڕی ، بەڵکو پەرەشیان پێدان و هەندێ لایەنیان لێ ڕوون کردەوە ، پێش کەوتن لە بەجیهانی کردنی جەنگەکانی رزگاری نیشتمانی لەرێ چەندەها بڕیار کۆمەڵەی گشتی وپەیمانەکانی ساڵی " ١٩٤٩ " ی ژنێف و پرۆتۆکۆلە پاشکۆکانی و ساغ کردنەوەی مافی چارەی خۆنووسینی گەلان لەبەڵگە نامە وباسەکانی ( UN ) دا ، یارمەتی ئەوەی داوە کە چەمکی جەنگە کۆلۆنیالیەکان و دواتریش چەمکی جەنگەکانی رزگاری نیشتمان مانای فراوانتر وقوڵتر وەرگرن .

لەم بوارەدا هەر دوو بڕیاری ژمارە " ١٥١٤ " ( کەباسی سەربەخۆیی گەلانی کۆلۆنیالی دەکا ) و ژمارە " ٢٦٢٥" ( کە باسی پەیوەندی دۆستانەی نێوان گەلان دەکا ) بە دوو بڕیاری بنچینەیی دەژمێردرێن ، یەکەمیان دوای ئەوەی ملکەچ بوونی گەلان بۆ داگیرکاری و چەوساندنەوەی بیانی بەپێشێل کردنی مافە مرۆیی وبنەڕەتیەکان دەژمێردرێ ، مافی چارەی خۆنووسین بە مافی هەموو گەلان ڕادەگەیەنێت .

خاڵی دووەمیشیان دەڵێت : ئەو گەلانەی بەرپەرچی کوتەکانی سەر پەیڕەو کردنی مافی چارەی خۆنووسین دەدەنەوە ، مافی گەڕان بەشوێن یارمەتی وبەدەستهێنانی یارمەتیان بەپێی بنەماکانی UN هەیە ، جگە لەمەش بڕیاری ژمارە ( ٣١٠٣ ) ی ڕۆژی ١٢ ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣ ، کەنایێتە بە بڕیاری پرەنسیپە بنەڕەتیەکانی تایبەت بە دەستووری دادوەری جەنگاوەرانی دژی دەسەلاتی کۆلۆنیالی وبیانی و ڕژێمە ڕەگەز پەرستەکان .

کە روخسارێکی رونتری بارودۆخی تازەی جەنگاوەرانی جەنگەکانی رزگاری نیشتمان دەخاتە بەرچاو .

وە جگە لەم بڕیارانەی UN یش کە ئاماژەمان بۆکردوون چەندەها بەڵگە نامە ومیکانیزمی نێودەوڵەتی جەنگەکانی رزگاری نیشتمان دەسەلمێنن کە گرنگترینیان پرۆتۆکۆلی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ و پەیمانی ساڵی ١٩٤٩ ی ژنێفە .

بەم بەڵگە نامە وبڕیارانەش بزافی رزگاری خوازی نیشتمانی کورد دەسەلمێندرێ و کورد لەم ڕەوشەوە مافی خۆیەتی کە داوای مافی چارەی خۆنووسین بکات ، کە خۆی بڕیاری لە سەر بدات و ئەگەر ئەمەش لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە کاری بۆ نەکرێت ، جگە لەخۆدزینەوە و خۆگێل کردنی ئەم ڕێکخراوە هیچی تر نییە ...

---

## سەرچاوەکان


- گۆڤاری سیاسەتی دەولی ، بنچینە یاساییەکانی مافەکانی گەلی کورد لەیاسای نێو دەوڵەتاندا ، د . ئالان دەرویش ، ژمارە ٢٧ ــ ل ٥ .
- گۆڤاری سەنتەری لیکۆڵینەوەی ستراتیجی ، ژمارە ٣ ، ساڵی حەوتەم ، مانگی ئابی ١٩٩٩
- ماجد عبد الرضا ، المسألة الكردية في العراق ، چاپی یەکەم ، لا ٦٥ / بەغداد .
- ڕۆژنامەی بزوتنەوەی ئیسلامی ــ فیدرالیزم تاکە چارەسەری واقیعی دۆزی کورد ، عەبدوللا مەلا ئەحمەد ، لا ٤ ، ژمارە ١٥٦ ی ڕۆژی ٣١ ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٤ .
- بەرنامە سیاسیەکانی ئاژانسەکانی هەواڵ .

# خوا ئەوە بگرێ کەسەری لەم کوردە شێواندووە


مامۆستا نوری فارس

جێگەی داخە کە بەشێوەیەکی گشتی ، لەمەڕێش هەستە نەتەوایەتی لەناو لایەنە ئاینەکانماندا ، بەتایبەتی لەناو مەلا وفەقێ و هەموو چین و توێژەکانی تری ئەهلی دینەدا سەرانسەری کوردستاندا ، زۆر کز ولاواز وبێ هێز بوو ، ئەم بەڕێزانە بەبێ ئەوە خۆیان هەستی پێ بکەن تواونەتەوە لەناو دەروبەری خۆیاندا وبەو پەڕی قەناعەتەوە ملکەچی وگوێ ڕایەڵی خۆیان بۆ ئەو نەتەوانەی تر کە داگیر کەرانی کوردستان بوون بە پەرستش وعیبادەت زانیوە ، ئەمە لەکاتێکدا کە ڕوناکبیرە ئاینیەکانی هەموو نەتەوەکانی تر مەلا وشێخ وئەفەندیانەوە ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان کردووە بەچەتر و بە قەڵغان بۆ نەتەوەکانی خۆیان و لەپەنای ئیسلامدا گەل ونیشتمان و قەوارەی خۆیان پاراستووە ، بگرە لە پیرۆزی ئیسلامەوە حوکمی ئەم و ئەویشیان بۆ سەدان ساڵ کردووە !

وە هەتا ئەمڕۆ لەزۆر شوێن ئاینی ئیسلامی پیرۆز بۆ زۆر گەل و نەتەوە لە جیهاندا نەبۆ: بەهۆکاری ناهێڵێ ئەوگەلانە سەر شۆڕکەن بۆداگیر کەرانی ولاتەکانیان ، بەڵکو بەماوەی ئەم پەنجا ساڵەی دواییدا زۆر لە گەلان غیرەتی ئیسلامەتییان جولاوە و داگیرکەریان ناچار کردووە کە دان بەمافی ڕەوایاندا بنێ و ولاتی خۆیان ئازاد کرد ، ئێمە قسەمان لەمەلا وزانا وپایە بەرزەکان نییە ، کە زۆرینەی ئەم کەلە زانایانە ، بەتاواتی یەنینی ئالای کوردستانەوە سەریان نایەوە .

ئەوەتا شێخی خاڵ " بەرەحمەت بێ " دەفەرموێت (( کوردایەتی خوا پەرستییە )) . ئایەتوڵلای مەردۆخیش کەساسی وبێکەسی کوردان بەم شێوەیە دەلاوێنێتەوە وەک دەفەرموێت :

**لەم خەوگای چەرخا ، منی شەیدائی**
**چاوێکم کەردو ، لە بۆبینائی**
**هەرچەنم کۆشا : کەس خەبەرە و نە و**
**لەبێ سیپا ، خۆشم چوومە و خەو !!**

جا بەنیازی پەندو ئامۆژگاری خێر نەوەك بۆ توانج و تانە و تەشەر ، بەراوردێ لەگەڵ ئەمڕۆ و دوێنێ دا دەکەین ، چەند نمونەیەك لەو سەر لێشێواندن و ئاشق بەبالای بیانی وکوڕی خۆ بەقوربانی کچی خەڵك کردنە دەهێنینەوە زۆر بەئەمانەت وبێلایەنییەوە :

١-مامۆستایەکی بەڕێز هەبوو لەم شارەی خۆماندا کە شاری نازداری سلێمانیە ، بەندە لەخزمەتیدا خوێندومە وە زۆرم خۆش دەوێ ، بەڵام وەك ئەفلاتون دەفەرموێ : ( هەق لەهەموو کەسێ خۆشەویستترە ! ) .

ئەم مامۆستایە مەلای وامەلا باش و زانا و بیرۆی کەم بوو ڕێژانە خۆراو خۆر وانە ودەرسی بە فەقیەکانی دەگوتەوە ، وەڵامی پرسیاری خەڵکی دەدایەوە کێشەی بۆ چارسەر دەکردن هەرچیشی لەم لایەنەوە دەکرد حسبەتوللابوو ، لەبەر خاتری خوابوو ، چەندین ئیجازە نامەی مەلایەتی بەفەقێیانی داناو زانا دابوو ، هەتابڵێی مەلایەکی مەلاباش و بیرۆی و قورس وگران بوو ، ئێمە لەم ڕووەوە هیچ گلەییمان لێی نییە بەڵکو دەڵێین : خۆزگە لەم لایەنەوە هەموو مەلاکانی کوردستان ئاوا بونایێ .

کەچی ئەم مەلا بەڕێزە لەگەڵ ئەم هەمکە عیلم و زانستەدا بەقەد شوانێ یا بەقەد گاوانێ هەستی نەتەوایەتی نەبوو بگرە شتی وای بە ڕەگەز پەرستی وبێ شەرعی دەزانی ، من خۆم ئەمەم لێ دیوە سەبارەت بەهاوسۆزی خۆی ، لەگەڵ هاولاتیەکانی خۆی ،کە جەماوەری خەڵکی سلێمانی بوون ، کەدرێغیان نەدەکرد لەخزمەتکردن و ڕێزگرتنی ئەوزاتە لەم بارەیەوە بەدەق لێم بیستووە دەیگووت ( لەبەر دەرگای مزگەوتەوە هەتا بەردەرگای خۆمان کە نزیکەی سێسەد هەنگاو دەبوو ، دروسەد تەرمی ئەم کوردی سلێمانی یە بکەوێ لاشە لەسەر لاشە کەوتبێ بەخەیاڵمدانایێ ، دەر بەستیان نیم ، بەمەرجێ چەکیەی کەراکەم خوێناوی نەبێ ولەنوێژ نەچێ ) .

بۆ بەرپەرچ و پاساوی ئەم بۆچوونەی خۆی دەیفەرموو : ( حەرامە خەم بۆ ئەم نوێژنەکەر وتەرازو بازانە بخۆی !! ) ، هەر ئەم مەلا بەرێزە لەهەمان کۆڕو دانیشتندا کە ئەم فەرمایشتەی تیادا فەرموو ، پاش دەوری نیو سەعاتێ باسی فەلەستین وشەری جوولەکەو عەرەب کرابێ ، دەیدا بەهەردوو ڕانی خۆی دا و زۆر بە پەرۆش وحەسرەتەوە دەیگووت و دەیگووتەوە : ( ئای کوژرایم دایێ ، ئێستا لەسەر ئەو خاکە پیرۆزە خوێنی خوێت نەدەیت بەرژان ، خوا ئەم ستەم کارانە بگرێ کە ڕێگەمان پێنادەن کە بچین شان بەشانی ئەو برا عەرەبە تێکۆشەرانەمان لەم غەزایەدا بەشداری بکەین ! ) کەچی لێیان دەپرسی : قوربان ! ڕات چییە دەربارەی مەلا مستەفای بارزانی ؟ دەیگووت : ( ... بەخوا هەرچۆن بێ خۆشم ناوێ ، خوێن ڕێژ بوو ، موسولمانانی زۆر بەکوشت دا ) .[1]

کەچی لەدوا جەنگی قەناتی سوێس لە( ١٩٥٦ )دا هەر ئەم زاتە دەیگووت :(عەرەب پیاویان هەبێت هەر جمال عبدالناصرە ! )

ئێمە لەنرخی خەبات وتێکۆشانی گەلی فەلەستین ومیسر لەدژی داگیرکەر کەم ناکەینەوە ، بەلکو ئەم دروگەلە بە برای هاوخەباتی خۆمان دەزانین ، بەلام لەم بانێکەو دروهەوایە سەرمان سووڕدەمێنێ : بۆچی هەموو جەنگاوەرێ لەدژی داگیرکەرانی ولاتی خۆیان بەموجاهیدو غەزاکار و خەباتگێڕ بزانین بێجگە لە پێشمەرگەی کوردستان و بێجگە لەسەرکردەی شۆڕشەکانی گەلی کورد ، بەلکو ئەمانە بە خوێنڕێژ وبکوژی موسولمانان دابنێین ؟! نوری سەعید و ئیبراهیم فەیسەڵ ئەنساری و عەلی کیمیاوی و سەدام حوسەین لەخەلیفەی عەصر بن !!! سەرکردە و شۆڕشگێڕانی کوردیش ئاژاوە گێڕ وخوێن ڕێژ بن ؟!!

پەککو لەم حەلاماتەی !! وەک بلێی : شۆڕشگێڕانی کورد ، ڕێگر وچەتەو جەردە بن ، لە مەرحەمەدی مەدەنی هەلگەڕابێتنەوە و چووبن لە بەصرە وناصریە وڕومادی وعەمارە و نەجەف وکەربەلا و هیت وعانە وراوە و ئەلووجە چووبن لەوێ بۆ تەماعی دنیا وبەس ، خەلکی بێتاوانیان کوشتبێ ماڵ وحالیان لەو بەستەزمانانە تێک دابێ ، بەلام عەرەبەکانی بەعس: وبەغدا وحیللە وعەمارە و نەجەف و کەربەلا وچار چارەش هی میسری وسووری ویەمەنی وئوردنی وخلیجی وفەلەستینی ... لەو دوور دوورەوە بەدەستی دەست نوێژەوە تەشریفیان هێنابێ بۆ کوردستان لە چیای قەندیل وهەندرێن وزۆزک وسەگرمە وهەورامان وئەزمەر وهەیبەت سولتان ولە سلێمانی و کەرکوک ولەدەشتی هەولێر وقەراج وخانەقین و بادینان و هەلەبجە و هەموو ناوچەکانی تری کوردستان ، پۆل پۆل کوردیان کوشتبێ و، بەهەزاران گوندیان سووتاندبێ ، بەهەزاران مزگەوتیان نوغرۆ و خاپور کردبێ ، قورئانیان سووتاندبێ ، بەلام تەنها لەبەر خوار ئاینی پیرۆزی ئیسلام ، نەوەک بەنیازی تەعریب و تەبعیث و جینۆسایدەوە .

ئەم عەرەبە موجاهیدانە لەم غەزا پیرۆزەیاندا ئەوەی تەماعی دونیا بێت نیانە !! وەهەزارانە پاش ئەوە بەتۆپ وتانک وفرۆکە وبەغاز وبەکیمیاوی و بەئاگر وبەئاسن ، گەلی کوردیان قەلاچۆکرد ، گۆڕی بەکۆمەلیان بۆ کوردان بەسەدان دروست کرد ، تەنیا سەد وهەشتاوپێنج هەزار کوردی هەژاری موسولمانیان بەناوی ئەنفالەوە زیندە بەچاڵ کرد ، ئەم موجاهیدانە ، ئەم ئەنفالچییانە ، پاش ئەنجامدانی ئەم هەموو کارەسات وتاوانانە ، بەدەستی خاڵی ، بەلام خوێناوی دەگەڕانەوە بۆ عەرەبستانی ولاتی خۆیان لەوێو چیای جەبەل حەمرینەوە تۆزی پێلاوەکانیان دەتەکێنن و دەلێن : ئێمە بۆ پەر وپیتی جیهان نەهاتووین تۆزی ئەم کوردستانەشمان پێحەرامە ئێمە بۆ پتەوکردنی برایەتی کوردو عەرەب هاتووین ، نەوەک بۆ تەماعی غاز و نەوتی کەرکوک وخانەقین و کانزا و خێر و بێری تری کوردستان هاتبین !!!

٢- دەی برا ! ئەوەتا هەموومان قیزمان دێتەوە لەهەلوێستی ئەم مامۆستایە و بەخۆفرۆش وبێگانە پەرستی دادەنێین ، بەلایەنی کەمەوە بەگێلۆکە وچەواشە بروی دادەنێین ، دەی پیاو ئینصاف بدا ئەی بەم زۆر بەڕێزانەی ئەمڕۆ بلێین چی کە شەو ڕۆژ هەر خەریکی ڕێکخستنەوەی ناوماڵی برا عەرەبەکانن و هەر خەریکی کۆتکردنی ( مصالحة وطنية ) ن و، پێیەک لە نەجەف وپێیەک لە کەربەلان ، ناوماڵی کوردەواری خۆیشمان ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر ژێرشان وسەرخانی هەلدەتەکێ وخوانەخواستە وا بڕوا کوردستان دەبێ بە دووەلی گەوانیف ، دەی برا دەبێ فەرقی ئەم کوردچیانەی ئەمڕۆ وئەو مەلا گێلۆکەیەی دوێنێ چیبێ ؟ بەلای منەوە جیاوازییەکە ئەوەیە : زیانی مەلاکە هەروبۆ خۆی بوو بەلام زیانی ئەم کوردچییانە مۆدرێنانە بۆ هەموو گەلی کوردە ، لەهەمووی سەیرتر ئەم بەڕێزانەی ئەمڕۆ هەر بەبرایەتی عەرەبیشەوە ناوەستن پەنجا پایزە برای تریان بۆ ئەم کوردە بێ کەسە پەیدا کردووە ، لەهەندێ شوێنی وەکو کەرکوک ئەو پایزە برایانە ژمارەیان بەقەد دانیشتوانی کۆلانێکی شۆڕیجە نابێ کەچی بەقودرەتی قادر لەفەزلی برایەتی و فرەییرەوە لەکوردەکە زیاتر دەستیان دەڕوا ، ئاخر ئەم بەڕێزانە نازانن براکان هەتا زۆر تربن لەبەشی برا کوردە بێکەسەکە کەم دەبێتەوە.

ڕەحمەت لە پێشینان کە دەفەرموون (( هەزار ساڵ بکەی بێگانە پەرستی ئاخری هەر دەکەی نوشستی !! )) .

٣- بەهەر حاڵ خوا پەنامان بدا لەوەیش کە خوانەخواستە وەک هەندێ کوردی عەرەب پەرست چاومان بەدیتنی ئالای کوردستان کوێر ببێ وە لەتاو کفری وا خۆمان بکەین بە قونبەلە وبۆمبا لە ڕۆژ و لە شوێنە پیرۆزەکاندا خۆمان بتەقێنینەوە بە جەماوەری موسولمانا .

دۆستێکم بۆی گێڕامەوە گووتی : لەم شەڕانەدا لەخەوما بوو بووم بە بۆمبا و دەمویست خۆم بتەقێنمەوە ، دەچوومە ناو هەر کۆمەلێکەوە هەتا خۆمیان پیا بتەقێنمەوە ، دەیانگوت : برا ئێمە نەکوردین ، نەموسولمانین ، ئیتر بۆ خۆت خەسار دەکەیت ، بڕۆ لە مەرقەدی حاجی کاک ئەحمەدی شێخ خۆت بتەقێنەرەوە پڕی لەکوردی موسولمانە !!!

بەڕاستی ئەم خەونە حەقیقەتێکی تالی دەبینی خستەوە ، لەدەوری ١٩٦٢ دا لەگەل " ف١ ل٤ " بوورم تەقەدورمیان کرد بۆ سەر باتوفە لەوێ دەگەیشتین بەگوندەکان ، پۆل پۆل خەلک لەسەر ڕێگە وەستابوون دەیانگووت : ئێمە نە کوردین نە موسولمانین ، ئێمە فەلیین ، ئیتر لەشکرەکە دەستی لێیان نەئەدا ، بەلام کە دەگەیشتنە گوندێ مەلا ومزگەوتی لێ بوایە ، دەیانگووت : خۆیەتی ، ئەمە ئەوەیە کە ئێمە بۆی دەگەڕاین ، ئیتر دەستیان لێ نەدەپاراستن بەکنلە کونی:

وەک مـــــۆم دەسوتا دارو بەردی دێ
وەک گزرە دەکەوت تەڕمی ئێر و مێ !!

هەر چۆن بێ ئاخر ووشەم ئەمەیە : ئەگەر کەسێ لەم باروودۆخەدا لێم بپرسێ : ئەرێ برالە ! تۆ گەشبینی یا ڕەش بین ؟ بەم چوارینەی مەلای گەورەی کۆیە وەلامی دەدەمەوە ، کە دەفەرموێ لەکاتی سەرەمەرگدا :

منیش هەروەکو غاندی
هەناسە سارد و ماندی
لەقەومی کورد وهیندی
ئەوەی خێر بێ نەماندی !

---

(١) ( نووسەر ) : ئەم ڕستەیە زۆر ناپەجێیە بەلام چونکە قسەی ئەو مەلایەیە من لێرەدا نەقلم کردووە بەلام خۆشم زۆر دژیم وقسەیەکی زۆر ناهەقە بەرامبەر بەو کەڵە سەرکردەیەی کورد و ڕەمزی کوردە.

# ئۆفا ... پادشای موسوڵمانی بەریتانی

ن : نۆرخان موحەمەد عەلی
و : عومەر عەبدولقادر

هەرکەسێك ئینسكلۆپیدیای بەریتانی یاخود ئینسكلۆپیدیای فەرەنسی ناسراو بە ((لاڕۆس)) بکاتەوە، لە سەر وشەی "ئۆفا: Offa" مێژووی ئەم پادشا ئانكلۆسەكسۆنیە.(١) دەخوێنێتەوە کە بۆ ماوەی سی ونۆ ساڵ فەرمانڕەوایەتی ئینگلتەرای کردووە (کە خەملێنراوە بە ساڵی ٧٥٧ز تا ساڵی ٧٩٠ز ) . وە لە بەهێزترین پادشاکانی ئینگلتەرا بووە لە مێژووی سەردەمە پێشینەکانی ئەو وڵاتەدا . یەکەمین کارێشی بوو بە پادشای (مارسیا : Mercia) یان کە ناو دەبرێت بە ئینگلتەرای ناوەڕاست : Middle England) ، ئەم ناوچەیەش -مارسیا- ناوچەیەکی پاشایەتی بووە، وە یەکێك بوو لەو حەوت پادشانشینیەی کە لەو سەردەمەدا لە ئینگلتەرا هەبوون .

دوای دەست بەسەراگرتنی ئەو پادشانشینە بچوکانەی کە لە دەوروبەری بوون، نمونەشیان وەك : (کەنت : Kent) و (ڕێست : West) و (ساکسۆنس : Saxons) و (ڕێلش : Welsh) . و فراوانبوونی ناوچەکەی و ، هەروەك هەستا بە بەشوودانی دوو کچی بە فەرمانڕەوای (وێساکس - وێسێکس : Wessex)و فەرمانڕەوای (نۆرپەمبیا : Northumbia) ، بەمەش جوارچێوەی دەسەڵاتی بەرفراوان بوو تا نزیکەی هەموو بەشەکانی ئینگلتەرای گرتەوە. چەند پەیماننامەیەکیشی لەگەڵ پادشای فەرەنسا (شارڵمان)و پاپا (ئەندریانی یەکەم) بەست

پاشماوەی سەردەمی ئەم پادشایە شوێنەوارێکی گرنگە، ئەویش: ئەو شورایە یاخود ئەو بەربەستەیە کە لەنێوان (مارسیا)و (وێلش) دا بنیاتی ناوە، تا ئێستاش هەر بە ناوی (شورای ئۆفا : Dyke Offa)وە دەناسرێت، تا ئێرە هەمووشتێك ئاساییە ... بەڵام ساڵی ١٨٤١ز، لەگەڵ خۆیدا لەنکاویەکی- مفاجأە- گەورەی بۆ مێژوونوسان هێنا : ئەویش دۆزینەوەی پارچە دراوێکی ئاڵتونی سەیرو سەمەرەی ونبو بوو کە بە تەواوی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەم پادشا بەهێزە ئینگلیزیە...

بەڵکوو نیشانەی سەیرێتی لەم پارچە ئاڵتونییەدا {کە ئێستا لە لقی -بەشی- دراوە کۆنەکانی مۆزەخانەی بەریتانیا پارێزراوە بۆ ئەوەی بە بەڵگەی ئەم لەنکاویە-مفاجأە- مێژوویە دابنرێت} لەوەدایە :- کە وشەی شەهادەت و ئایەتێکی قورئانی بە زمانی عەرەبی لەسەر هەردوو ڕووی پارچە دراوەکە نوسراوەو دەبینرێت(٢) ، ئەمەی خوارەوەش درێژەی باسی ئەم پارچە دراوە مێژووییەیە :

لە ناوەڕاستی ڕویەکیدا نوسینێکی بە زمانی عەرەبی لەسەرە و، نوسراوە : (لا اله الا الله وحده لا شریك له) وە لە قەراغەکانیشی: (محمد رسول الله)و پاشان (أرسله بالهدی ودین الحق لیظهره علی الدین کلّه) نوسراوە، هەروەها لە ناوەڕاستی ڕوەکەی تریدا -واتە ڕووی دووەم- بە هەمان شێوە بە زمانی عەرەبی نوسراوە(محمد رسول الله) ، لە ناوەڕاستی وشەکانی ئەم ڕستەیەشدا بە زمانی ئینگلیزی نوسراوە "offa-Rex" واتە "پادشا ئۆفا" وە لە قەراغەکانی هەمان ڕوودا -ڕووی دووەم- نوسراوە: (بسم الله ضرب هذا الدینی سبع وخمسین و مئة) واتە "بەناوی خوا ئەم دینارە (حەوت)ی و (پەنجا)ی و (سەد)یانە لە سکەدران" (٣).

هەروەك لە ئیمزای(٤) پادشا ئۆفا دەگەین کە لەسەر ئەم پارچە دراوە کردویەتی لە ماوەی نێوان ساڵانی (٧٥٧-٧٩٦)ز {ئەمەش ئەو ماوەیەیە کە پادشای ئانكلۆسەكسۆنی -ئۆفا- فەرمانڕەوایەتی تێدا کردوە}، وە ڕێك دەکاتە ساڵی (١٥٧ك-٧٧٤ز)(٥) .

وە هەروەها چەندین موحازەرەی لە سەر پێشکەش کراوە دەیان وتارو توێژینەوەی دەربارە نوسراوە

دەتوانین پوختەی گریمانان و پەختەی گریمانەکانی مێژوو نوسان دەربارەی ئەم بابەتە لەمانەی خوارەوەدا دەربخەین ...

گریمانی یەکەم :- پادشا ئۆفا باوەشی بە ئیسلامدا کردووە -إعتنق الإسلام. واتە ( موسوڵمان بووە) .



گریمانی دووەم :- ئەو وشە عەرەبیانەو ئەو ئایەتە قورئانییەی کە لەسەر دراوەکە نوسراون، تەنها وەك نەخش ونیگارو جوانی بەکارهێنراون بەبێ ئەوەی لە ماناکانیان بگات .

گریمانی سێیەم :- لە سکەدانی ئەم دراوە بۆ هاوکاری (حاجی)یە(٦) هاونیشتمانیەکانی بووە لەو کەسانەی کە ئارەزوی سەردانی قودسیان هەبووە ، بۆ ئەوەی بەکاری بهێنن لای موسڵمانەکان(٧) بۆ دەستەبەرکردن و کارئاسانی گەشتەکەیان بۆ شوێنی دیاریکراو .

یاخود: هۆکارێکی سیاسی بووە .

گریمانی چوارەم :- پادشا ئۆفا لە ساڵی (٧٨٧ز) پەیماننامەیەکی لەگەڵ پاپا (ئەندریانی یەکەم) بەستووە، لەو پەیماننامەیەدا بەڵێنی بە پاپا داوە کە هەستێت بە دانی ئەو فیدیە ساڵانەی کە پێویست بووە لەسەری بیدات، وە دەبێت ئەم پارچە ئاڵتونیە بۆ ئەم مەبەستە لە سکە درابێت .

گفتوگۆو لێکدانەوەی ئەم گریمانانە

ئاشکرایە ئەم سێ گریمانەی کۆتایی (دووەم، سێیەم، چوارەم) یەك ناگرنەوە لە گەڵ ژیری مرۆڤێکی ساغ و بێودیدا، چونکە ناگونجێ پادشایەك هەستێت بە نوسینی ڕستەیەك کە واتاکەی نەزانێت، وە تەنها لە پێناوی ڕازاندنەوەدا نوسیبێتی. وەك زانراوە کە ئەم ڕستەیە بریتیە لە وتەی شەهادەت کە پوختەی بیرو باوەڕی ئیسلامیە .

ڕاستە هەندێك پادشای ئەوروپی کەشەنگ - تەنگەنەفەس - بە شارستانیەتی ئیسلامی جاروبار هەستاون بە نوسینی ناوەکانیان بە زمانی عەرەبی لە سەر ئەو دراوانەی کە لە سکەیان داون، نمونەیان وەك :- "ئەلفانسۆی هەشتەم" و "ڤاسیلی دیمیتریش" و هەندێك لە دەسەڵاتدارانی (نۆرمان) وەکو "ولیام ڕۆجەر" ، تەنانەت (ئیمپراتۆر)ی ئەڵمانی "هینری چوارەم" ناوی خەلیفەی عەباسی ﴿ موقتەدیر باللە (المقتدربالله) ﴾ لەسەر دراوی وڵاتەکەی نوسیوە، بەهۆی سەرسوڕماوی بەو خەلیفەیە .

بەڵام هیچ کام لەمانە وەك پادشا ئۆفا وشەی یەکتاپەرستیان نەنوسیوە بە بێ هۆشیاری.(٨).

بە گوێرەی گریمانی سێیەم کە ئەویش دوورە لە گونجان و وە هەروەها لاوازیشە ، چونکە قورسە قەناعەت بەوە بکرێت کە پادشا ئۆفا ئەم دراوەی بۆ هاوکاری حاجیە هاونیشتمانیەکانی لەسکە دابێت بۆ کارئاسانی سەردانەکەیان بۆ قودس، ئەمەش لەبەرئەوەی موسوڵمانان لەو سەردەمەدا هیچ بەربەست و ڕێگریەکیان نەکردووە کە نیشانەی کۆسپ و تەگەرە بوبێت لەبەردەم هەر مەسیحیەکدا لە سەردانی بۆ شارە پیرۆزەکانی لای موسڵمانان، ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە، لە بنەڕەتدا مەسیحیەکان بوون کە بەدەوپەری سەربەستیەوە بە وڵاتانی ئیسلامیدا گەڕاون .

بە گوێرەی گریمانی چوارەم کە گریمانێکی تەواو سەیر و نامۆو ناواقیعیە، چونکە چۆن دەگونجێ پاپا داوا لە پادشا (ئۆفا) بکات کە گەواهی یەکتا پەرستی - شهادة التوحید- لە سەر ئەو دراوی (جزیە)یە بنوسێت کە پێویست بوو لەسەر پادشا ئۆفا بیدات .

ئایا ئەمە شتێکی ناژیری -غیر منطقي- و نەگونجاو نیە بە تایبەت کە ئێمە دەزانین ئەو پلەو پایە (پاپا)یەتیەی ئەو سەردەمە یەکێك بووە لە سەرەکیترین دوژمنەکانی ئیسلام. بۆیە شتێکی سروشتیە ئەگەر پاپا بەرپەرچی ئەوە بداتەوە کە دروشم و بیرو باوەڕی دوژمنەکەی لەسەر ئەو دراوە ببینێ، ئەگەرچی بۆ جوانی و نەخش و نیگاریش بوبێت .

لەوانەیە ئەگەری ئەوە بەهێزیندا بێت کە وڵاتی ئەم پادشایە لەو کاتەدا توانای لە سکەدانی دراوی نەبووە، بۆیە هەستاوە بەلەسکەدانی دراوەکانی لە یەکێك لە وڵاتانی عەرەبی. وە هەروەها ئەم ئەگەرەش دەست نادات، چونکە ئینسکلۆپیدیای بەریتانی باسی گرنگترین کارێکی وون بوو دەکات کە لە دەورو بەری فەرمان ڕەوایەتی ئەم پادشایە ئەنجام دراوە ئەویش بنیاتنانی (دامەزراوەیەکی دراو) و لە سکەدانی جۆرێك پارەی نوێیە، کە ناوی پادشا و ناوی ئەو کەسەشی لەسەرە کە لەسکەی داوە، وە زۆر پارەی تریش هەیە کە وێنەی پادشا ئۆفا یا وێنەی هاو سەرەکەی شاژنە (کانیریز : Cynethryth) ی لەسەرە .

وەهەر ئەم ڕژێمەش بوو کە چەند سەردەمێك بۆ لە سکەدانی پارە بە هەمان شێوە لە ئینگلتەرا بەکاردەهێنرا .

دەتوانرێت لە ڕێبەری دراوەکان "Coins"ی ئینگلتەرادا چەند نمونەیەکی تری ئەو دراوانە ببینرێت کە لەسەردەمی ئەم پادشایە لە سکە دراون .




وه ڕێبەری ژیانی ئەو پادشایە لـە ئینسـکلۆپیدیای بـەریتانی دا بەرپـەرچی هەر نەگەڕێك دەداتەوە کە پێی وابێت ئەم پادشایە توانای لەسکەدانی دراوی نەبووە لە وڵاتەکەیدا .

ڕاستیەکی ئاشـکرا هەیـە ئـەویش ئەوەیە : کە ئەوە پادشا ئۆفا بووە باوەشی بە ئیسلامدا کردووە، بەڵام ئێمـە هیـچ بەڵگـەیەکی دیکـەمان نەدۆزیوەتـەوە، وە هیچ بەڵگەیەکی تری بەڵگەنامەیش نییە جگـە لـەم دراوە، وە شـتێکی تـەوتۆش دەربـارەی چۆنیەتـی موسـڵمان بوونـی نازانین ؛ هـۆی ئەمــەش دەگەڕێتــەوە - هـەروەك مێـژوو نوسـان دەڵێـن- بـۆ کلێسـای ئینگلـیزی - الكنيسـة الإنجليزية - کە هەستاوە بە لە نـاوبردنی هەموو ئەو بەڵگەنامانەی دەگەڕێنەوە بـۆ ئەم پادشایە بە هـۆی بـاوەش کردنـی بە ئیسلامدا .

ئەم پادشایە بە تەنها خۆی باوەشی بە ئیسلامدا کردوە یاخود لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکـەیی و نزیکـەکانی، ئەمەیـە کـە ئێمـە نـایزانین و زانیاریـەکی تـەوتۆمان دەربارەی نیە .

ئەوەی کـە ئێمـە بروامـان پێیـەتی ئەوەیـە کـە پێدەچێـت ئـەم پادشـایە بـە هـەندێك لـە موسـڵمانان و چـەند ڕابەیەکیان گەیشتبێت لە کاتی سەردانی بۆ شـاری قـودس، بەمـەش بـاوەڕی بـە ئیسلام هێناوە و باوەشی پێدا کردووە.

شـتێکی سـەیر ئەوەیـە ؛ کـە نـە ئینسـکلۆپیدیای بـەریتانی و نـە ئینسـکلۆپیدیای فەرەنسـی -لارۆس- ئاماژەیان بـۆ ئـەم لایەنـە نـەکردووە، بـەڵکوو بـە تـەواوی فەرامۆشـیان کـردووە . وەئەمـەش پشتگیری بیروڕای ئەو کەسانە دەکات کە پێیان وایە ؛ تەنانەت ئەم ئینسکلۆپیدیا ناسراوانەش ئارایشت بە ڕۆح نابەخشن، وە دەبوایە بێلایەنیشیان تیادا دەربکەوتایە .....

تا ئێرە لەمە زیاتر ناڵێین .

**چەند پەراوێزێك (بە پێنوسی وەرگێر)**

١ -(ئانگلۆسەکسۆنی) نـاوی یـەکێك لـە بنەماڵـە بـەهێزو بەناوبانگـەکانی ئەکاتـەی ئینگلتەرا بووە کە فەرمانڕەوایەتی بەشێکی گەورەی ئەو وڵاتەیان کردووە، وە پادشا ئۆفا لـە ئەوەی ئەم بنەماڵەیە بووە هەروەکو نوسەر ئاماژەی بۆ کردووە.

٢- خوێنەر بـۆ بینینـی وێنـەی ڕاستـەقینەی هـەردوو ڕووی دراوەکـە دەتوانێـت سـەرنجی پەرتووکی ﴿ تراث الإسلام، الجزء الأول، طبعة الأولى ١٩٥٤م ، ص١١٢﴾بدات کە کۆمەڵێك ڕۆژهەڵاتناس بەسەرپەرشتی ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ (تۆماس ئارنۆڵد) نوسیویانە.

٣- دیارە ئەم دراوە لە ڕووی بەهاوە چەند جۆرێك بووە.

٤- مەبەست لەم ئیمزایە، ناوی پادشا ئۆفایە کە لەسەر دراوەکە نوسیویەتی.

٥- ئەم بەروار (١٥٧ك-٧٧٤ز)ئاماژەیە بۆ ساڵی لەسکەدانی دراوەکە.

٦- ڕەنگە نوسەر ئەم دەستەواژەی بۆ گەشتیارە ئینگلیزەکان بەکارهێنابێت، ئەمەش بـەو مانایەی کە سەردانی جێگە پیرۆزەکانی موسڵمانانیان کردووە ؛ هـەروەك چـۆن موسـڵمانان سەردانی دەکەن. نەگ مەبەستی کۆمەڵێك مسـڵمان بێت کە بەڕەگەز ئینگلیز بن و بە نیازی بەجێهێنانی فەرزی حەج هاتبن بۆ مـەککە (وەهەروەها نوسەر - لە دواتردا- ئاماژە بۆ شـاری قودس دەکات نەك شاری مـەککە کە شوێنی جێبەجێکردنی ئەو فەرزەیە).

٧- چونکە موسوڵمانان لەو سەردەمەدا فەرمانڕەوایەتی (قودس)یان کردووە.

٨- ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە پادشا ئۆفا زۆر چاك لە مانای ئەم دەقانە گەیشتووە.

**ئەمەش دوو وێنەی دەستکردی هەمان شێوەی هەردوو ڕووی دراوەکەیە**




سەرچاوە : گۆڤاری ﴿الرباط﴾، ژمارە (١)، ساڵی یەکەم - شعبان ١٤٢٤ﮬ - تشرینی یەکەم ٢٠٠٣ز

# بەزۆخالبوونی کەژاوەیەک لەگۆلە ڕووپاکەکانی کوردستان بۆ ؟



عادل شاسواری
adilshaswary2000@yahoo.com




لەوساتە وەختەوە کە بەکەسێکیان ووتوە بەوەجاخە واتە : کە کەسێکە وەجاخی ڕونە ، وەجاخ یەکسان نە بە ئەو ژن ومالّ ومنالەی کە لەناو حەرەمی مالّی ئەودا ئاوەدانیەکی دروست کردووە ئەگەر زۆر تر بڕۆین بۆئاو قولایی ڕەهەندی وەجاخەوە ئەوا وەجاخ ئەبێتە ئەو کوانووەی کە لەومالەدا ئاگری تیادا ئەکرێتەوە ئەو ئاگردانەی کە ئەبێتە هۆی گەرمی وڕوناکی مالەکە ، بەمالێك ئەوترێت وەجاخی ساردە واتە کوانووی ئاگرەکەی ناگرێت و واتە مالێکی هەژارن وهیچیان نییە .

لێرەدا واتای وەجاخ دوورەهەند وەردەگرێت ، جارێك بەمانای ئاگر وئاگردان و زۆپا و کوانوو دێت جارێکی تر بەمانای کەیبانوو و ژن و خێزان دێتەوەندەشی ژن و خێزان لەگەلّ ئاگرداندا خەریکن ، ئاگردان بوە بە مالّ و مالیش یەعنی ژن .

ئەگەر تێبینی بکەین ووشەی کوانوو لەگەلّ کەیبانودا زۆر لەیەکەوە نزیکن کە ئەکاتە کورتەی مانای وەجاخ ، ئەم کورتە پێشەکی یە بۆ ئەوەم هێنایەوە کاتێك کچێك یان ژنێك کە لەوپەڕی تەمەنی گەنجیدایە بۆچی دەچێتە کەژاوەی قەقنەسی هەلالەکانەوە بۆچی دەستی دەچێتە گیانی خۆی و لەوێنەی پەلکە زێڕینەیەکی سوتاو زیاتر هیچ لەدوای خۆی جێناهێلێ .

ئافرەت ، ژن ئەو جەستە وڕۆحە گەرمەیە کە لەمالدا مایەی گەلالەکردنی کۆی گەرمی و خۆشی و چێژ وئاوەدانی مالە وە ئەویش هێندەی لەگەلّ تەباخ و ئاگردان و ئاگردا ئەژی هەرگیز پیاو وا لەگەلّ ئاگردا ئاشنا نییە بۆیە ئافرەت لەکاتی تەنگانەشدا هەر هانا ئەباتەوە بەر ئەوەی کە زیاتر لەگەلیا ئاشنایە ئەو هاوڕێیەی کەشەو و ڕۆژ لەگەلیدا هەلس وکەوت دەکات ئەگەر میوانێکی بێت بەهۆی ئاگرەوە شتێکی بۆ ئامادە دەکات ، کاتی ژەمەکانی خواردن بەهۆی ئاگرەوە ئامادەکات ، هەربۆیە بۆکاتی مالئاوایشی لەم ژیانەی هەر بەهۆی ئاگرەو مالئاوایی لە تەمەن و جوانی خۆی دەکات.

ئەمە ئەکرێت خوێنەوە یەك بێت بۆ ساکۆلۆژیەتی ئاگر ونزیك بوونەوەی لەڕۆحی ژنەوە . لەم ماوەیەی ڕابردوودا هاوڕێیەکی ئازیزم هاتە لام و باسی گولالە سوتاوەکانی نەخۆشخانەی ئیمێرجنسی ئەکرد کە بۆ خۆی یەکێك بوو لەوکەسانەی کە چ وەك کارمەندێك لەوێبوو هەم وەکو ئاواتیش هیوای ئیشکردنی بوو لەو بەشەدا ، لەبەر ئەوەی کەبۆخۆی کە سێکی بەسۆز بووە






ـە لایـەك بەرگـەی ئـەو نەخۆشـانەی
ـەگرت بەتایبەت کچان و ژنانی ئـەم شارە
ـە بەسـوتاوی و نیمچـە زوخـالی ئەهاتنـە
ـەردەستی ئەو لە لایەکیش چونکە مەرد بـوو
هۆکـاری زۆرێـك لـە بـەرەژوورێبونی ئـەو
تەنـسی هەلالانەی ئەگێڕایەوە بۆ هەژمەرونی
ـستەمی ) پیـاو لـەماڵدا بەهەرسـێ جـۆرە
ـراکتەری ( باوك ، بـرا ، مـێرد ) هەربۆیـە
ـەوێی هـەڵبژارد و وەك گۆڕەپـانی
ـەرمەتکردنی ئەو بەرەژووی گوڵە ناسـکەکان
جـا ئـەو هاورێیـەم کـەمێك لـەلام گریـا ،
ـێش دەمزانی ناخی دەسوتا و ئـەیزانی کـە
ـەوانە زووربەیان ئـازار ئـەدرێن و وە رۆحیـان
ـریندار دەکرێت گڕلە ورێژدانیان بەر ئـەدرێت
هـەموو جـۆرە ئومێدەکانیـان دەسـوتێنرێن
ـەبەر چاویاندا ، ئینجا ئەوانیش ناچـار دەبـن
ئـر لەجەسـتەی خۆیـان بـەربدەن ، بۆیـە
ـ(( بەحوزنێکی قوڵـەوە دەیـوت : مـەحزونم
ـەوەی : کە کەژاوەیەك لە ئەسـتێرەی جـوان ،
ـەپەلکـە زێڕینـەی ڕەنگـاو ڕەنـگ ، لـەکچ
ـکیژۆڵـەی ڕووپـاك ، دەم بەخـەنـدە غـەدرلێ
کراو ئەبن بەدەستی بێ بەزەییانە بـەو ناکامـە
پڕ لەحەسرەتە ئەگەیەنرێن ، بەهەموو جۆرێك
ـیهانە ئەکرێن ئەتۆرێنرێن ، ئاخر کچ ناسکە
ـزۆر بەئاسانی ئەتوانی رۆحی بکەیتـە خرخاڵ
تەنانەت لەکریستاڵیش ناسکترە هەر زۆر زوو
ـەژیان ئـەتۆرێت ، وەرە بڕوانـە ئـەو هـەموو
ـسووتاوانە دە کچ بیست کچ خۆیان ئەسوتێنن
ئینجا لەوانەیە کوڕێك دەستی بچێتە خۆی ،
ئەمـە ئەگـەر هـەر مانایـەکی لێ وەربگریـت
ـپێش هـەموو شـتێك ئـەو مانایـە ئـەدات
بەدەسـتەوە کـە کـچ چـەندین جـار لـەکوڕ
کریسـتاڵیترە ، رۆحـی ناسـکترە ، دڵ
ـدەروونـی بەتریفـەترە ، هـەر بۆیـە بەهـەڵس
ـوکـەوتی ژیرانـەی پیـاو زوڵەتریفـە ئەکـەوێت
ـزووش رۆحـی بـەخرخاڵ دەبێـت زووش دڵ
ـدەروونی ئەشکێت .

بۆیە کاتێك کە گوێ ئەگرم لەچیرۆکی ئەو کەژاوە سووتاوانە رۆحی منیش لەگەڵ ئەواندا ئەبنە هاوبار و هاودەم و هاورازی خەم وحوزنە قوڵـەکانیان ، کـاك عـادل لـە بەینـەدا " خونچە و گوڵ ودێ و دابـان وچیـا وشـەوبۆ و تریفە وهەناسە و وژیان و گیان و ..کـێ وکـێ وکـێ " یان هێنا ، کەهەر یەکێکیان بۆخـۆی ودلامێك بوو لەراز و دیوانێك بوو لەشـیعر و کتێبێك بوو لەحەسـرەت دەریایـەك بـوو لـە میهرەبانی و کۆگایەك بوو لە ئومێد وهیوا و ئـەم لاشـەوە یـەك پارچـە زوخـاڵێك بـوو لـە جەستەوە قەقنەسێك بوو لەبالا )) .

منش ووتم : " مـەریوان" گیـان رۆحـی ئەوان لێوان لێوە لەسـۆز وقوڵـپ ئـەدات لـە ئەندێشە و تا چاو بڕکـات پـڕ لـەهیوا ، تـۆ پێت وایە چ شـتێك ئـەو رۆحـە پـڕ لـەهیوا و بڕوایانە بەکـەژاوەی سـووتان ئەگـەیەنێت ، " مـەریوانی هاورێشـم " ووتـی : بەگشـتی لەوانەیـە هۆکـار زۆریـن ، بـەلام مـن لـێرەدا قسـەم لەسـەر ئـەو گولانـە نییـە کـە بـەهۆی رووداوێکـەوە کـە مەبەسـتی خۆسـووتانی خۆیـانی تیـادا نییـە چونکـە ئەوانـە زیـاتر هەستی مـن ئـازار ئـەدەن ئەوانـە پەرییـەکی رووپاکن هەرچی یەك لەبارەیانە وە بڵێم هـەر کەمە ، بەلام من لێرەدا مەبەستم لەو گولالە


مەریوان مارف حەسەن

سورانەیە کە دەستی خۆیان جێبەجێکەرێکی کارەکەن و دەستی پشت پەردەشـەوە فرمـانی پـێ دەدات و هـانی ئـەنجامدانی ئـەوکارەی دەدات و هەموو ڕێگاکانی لەبەر دادەخـات و تەنها ڕێگەی ئەوەی لەبـەر دەم والا دەکـات و شـوعلەکەی بـۆ دادەگیرسـێنێ بـەلێ بـەلام ئەمانـەش لاوازی بڕوایـان بـە پـەروەردگار لەساتێك لەساتەکانی کلپە لەخۆ هەسـتانیان ئەگاتە سفر بۆ یە ئەتوانن دەنکە شـقارتەکەی دەستیان داگیرسێنن .

ئەڵێم ئێمە پەروەردگارێکمان هەیـە تـادڵ بخوازێت میهرەبانە و تا هەناسـە بخوازێـت پـڕ ژیانە ، تاچاو ببینێت ئـەولاتریش بـە بینایـە وچـاوی بـەصیرەتی ئەهـەموو ئەسـتەمانە ئەبینێت کەلەو خونچە گولالانە دەکرێـت بـۆ یە ئەگەر ئەمانیش تا ئەو رادەیە

ئـەو زاتـە میهرەبانـە هەسـت پـێ بکـەن بەتایبـەت لـەکاتی پـەنا بـردن بـۆ دەنکـە شقارتەکە ئـەوا هـەرگیز نـاتوانن کـرزەی لێ هەڵبستێنن و کلپەبکات )) .

منیش لەناو حەسرەتێکدا بووم ئایا هـەر بـەدیار ئـەم رازی گوڵـە سـیس بوانـەوە ڕۆژمێرەکە هەڵدەمەوە وەکو کەسێکی بـێ بـاك لەخودی کارەسـاتەکە ژیـن بگوزەرێنـم ، وەکـو کەسـێکی بەسـۆزیش لەبـەر خۆمـەوە لەگـەڵ مەریوانی هاوڕێمدا فرمێسك برژێنم .

چونکە ئەو زۆر هەواداری ئەو هـەموو خەم وئەندێشە وهیوا بەرینانە بوو لەلایەکیش ئەکرا ئەوێ بەجێ بهێڵێت و بڕوات بۆجێیـەکی تـر و کار و وەزیفەیەکی تـر هـەڵبژێرێت ، بۆیـە پێم ووت هـاوڕێم : تـۆ ئەگـەر تریفـەی سـوتاو و ڕەژووی گـوڵ وقەقنەسـی هەلالـە ، خنکـانی کانی ، فرمێسکی خوێنین ، کـەژاوەی خـالی ، سووتانی پەلکە زێڕینە ، ئازاری کـچ ، حوزنـی ژن ، بۆکروزی ئافرەت ئازارت ئـەدات ورۆحـت برێندار ئـەکات و ئیـتر نـاتوانی بەرامبـەر بـەو هەموو مەملەکەتی بـرژان زوخالـە بێدەنـگ بیـت ، بـەردەوام لەگـەڵ هـەڵقرچانی کیژۆلەیەکی نوێدا تۆش ئەسوتێیت ، لەگـەڵ بەناکام گەیشتنی مانگێکی سوتماکدا تـۆش گیان ئەدەیت ئەوێ بەجێ بهێڵـە .. هـاوڕێم .. لەوێ بڕۆ ..

ــ هەرچەند بیر ئەکەمەوە ناتوانم .. ئـەوە راکردنە لەواقیع .. ئاخر تـۆ بۆخـۆت ئـەزانی کـە مـن رۆحێکـم لـە حـوزن و بالایـەکم لەحەسرەت و ڕووبارێکم لەگریان ، ئایا ئەگـەر مـن ئـەو کیشـوەری سـووتانە جێبهێڵم ئیتر هیچ گوڵێك نابێت بە قەقنەس ؟ ئیـتر هیـچ کەژاوەیەکی ئەو خونچانە ناگاتـە دەر بوونـەی مەرگ ؟ ئیتر کەیبانوویەك نابێتە کروانوو ؟؟

دەی کەواتـە .. بـژی و بمێنـە لەگـەڵ غوربـەتی خـەم ودەرنـەچوونی هەناسـە و سـووتانی شـوعلە وسـیس بوونـی بـاران و خنکانی پێکەنین ، قریوەی کیژانی بـەر باڵـە کوتەکانی ژیان ، برایەکی باش و هاورێیەکی نزیـك وگیـانێکی گـەرم وهاوکـارێکی بەردەوامیان بە ئـەوەندەی ئـەتوانی هـەوڵ بـە چیرۆکـەکانیان ، بیرەوەرییـەکانیان یاداشـت بکـەیت و ، فرمێسـکەکانیان بنووسـیتەوە .. هێندە فرمێسکیان لێ بخوازە تافرمێسـکیان لانامێنێ و بکەونەوە بارەشی ئەوین و خـەندە ڕیێکەنین ، بیانسپێرە بەخوایـەکی میهرەبان کە خاوەنی مانگە شەوێکی ڕوونە کە خاوەنی گەلـە ئەسـتێرەیەك تریفەیـە کـە خـاوەنی خۆرێکـە ئەرشـیفێك رونـاکی لەلایـە ، بـەژیانێکی نـوێ ، داهاتوویـەکی جیـاواز ، ئاسـۆیەکی تـر ، سـوار چـاکێکی خـەیاڵ بیاغەرە ناو کـەژاوەی خەونـەوە وبەسـەر یـالی فردەوسێکدا بەرەو گەیشـتن بەترۆپکی هیـوا وخەونەکانیان بیاغەرە ڕێ .

هاوڕێم تکایە هەمیشە تـۆ گوڵی سیس بوونی هیوایان بگەشێنەرەوە لـە چرکەیـەکی گیاندانیـان باسـی گەشـترین ڕۆژی ژیـان ، مەزنترین هیوای تەمەنیان بۆ بکە .



# بۆچوونەکانی سەبارەت بە ئافرەت

بەشی دووەم

نیمان کەریم

کارێکی زۆر گران نییە لەسەر ئەو کەسەی کە بۆچوونی جۆراوجۆری هەیە سەبارەت بەئافرەت کە پتر لە نموونەیەك بهێنێتەوە بۆ چارەسەرکردنێك کە ئامانجی بەرزکردنەوەی ئاستی ئافرەت بێت بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر ڕەهەندی کۆمەڵایەتیی ئەو چارەسەرانە ، چۆن دەبێت ئافرەت بەکەم بزانرێت لە بارەی خزمەتکردن وسەرپەرشتی‌کردنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە ، وە چۆن ئەوانەی کە هەڵوەسێنەری ئەم جۆرە چارەسەرانەن ناچار دەبن بچنە سەر ئەوەی کە ئاستی مەشقپێکردنی داواکراو کەمی بکەنەوە و چاو بپۆشن لە تایبەتمەندێتی ئزیۆلۆژی و دەروونی ئافرەت لە پێناوی یەکسانی پێدانیان لەکاتێکدا کە ئەوان هەموو بوارەکانیان پڕکردوەتەوە .

وە لە بارودۆخێکی لەم جۆرەدا دەر ئەنجامەکان ڕەنگ دەداتەوە لەسەر سەلامەتی هەموو کۆمەڵگە بەشێوەیەك کەئەو کاتە ئاستی ڕاهێنانەوە و مەشقکردن بەبێ ئەو بنەمایانەی کە پێویستێتی دەگۆڕێت بۆ هەڕەشەیەك لەسەر بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگە ، کەواتە باشتر وایە کە بڵێین سەرپەرشتیاری بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگە یە ، دان نان بە ناسەرپشکردنی ئافرەت لە هەندێ لێپسراوێتیدا لە پێناوی پارێزگاری کردن لەسەر ئاستی ئامادەکارییە پێویستەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی جدی بۆ ئەرکەکان وفێڵ نەکردن لە ئەرکە پڕوپاگەندەیی‌یەکاندا .

ئافرەت بەردەوام وەك کێشەیەکی بەردەوام دەمێنێتەوە تاکو ئێمە واتێی بڕوانین کە ئافرەت ڕەگەزێکی ئاینده بێت ، وە تاوەکو ئێمە نەگەڕێین بۆ ئاراستەکردنێك کە بگونجێ لەگەڵ چالاکییە کۆمەڵایەتیەکان .

ئەو پەراو و نووسراوانەی کە پێگەیەکی بۆ ئافرەت دانەناوە کە ئەوان بریتیبن لە بەشێکی کۆمەڵگە وەکو ئەوە وایە کە ئەندامێك نەبن لە ئەندامەکانی یەك قەوارە ، - بۆ نموونە سەلامەتی دەست: ئەگەر هەندێ پێویستێتی تایبەتی خۆشی هەبێت وەك نینۆك کردن - ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ سەلامەتی هەموو جەستە وە لاوازی جەستە یان لاوازی پەیوەندی‌لە نێوان ئەو ئەندامە و ئەندامەکانی تر ئەوا بۆخودی خۆی توشی لاوازی و نائارامی دەکات .

ئەگەر بمانەوێت کە ئافرەت لەم جەنگەدا سەربخەین لە دژی ئەو ناڕەحەتییە و وە دژی هەستی ئەوانەی کە دەوریان داوە لەدوای بەدیهێنانی خودی خۆی ئەوا پێویستیمان بەوە هەیە کە ڕووبەڕووبونەوەی ئەو بار و دۆخە بکەین ئەویش لەسەر بنەمای دیدگایەکی شمولی دیسانەوە لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئەوە قەیرانێکی کۆمەڵگەیە نەك قەیرانێکی ڕەگەزێك یان جنسێك بێت بەبێ ئەوی تریان .

وە ئەو کاتە پێویستە لەسەرمان کە دەرك بکەین بە لایەنی فکری و ڕۆشنبیری باڵادەست بەسەر کۆمەڵگەدا بەگشتی بەتایبەتی بەسەر خودی ئافرەتدا ، وە ئەوە بنرخێنین کە شێخ موحەموود غەزالی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) کاتێك وتوویەتی ( تەخەلفی دەروونی و زەهنی توشی نەتەوەکان نابێت بەشێوەیەکی کتوپڕی ، بەڵکو لەدەرئەنجامی چەند نەخۆشییەکی درێژخایەنەوە توشی دەبێت وە ئەو چارەسەرەشی زۆر بەئاسانی نادۆزرێتەوە ) .

ئەوەی کەلێرەدا گرنگە کە باسی لێوە بکەین بریتییە لەو فاکتەرە زاڵانەی کە زاڵە بەسەر کۆمەڵگە و بەسەر ئافرەتیشەوە ، کە لەیەکتر جیانین ، بەڵام ئێمە خۆمان جیای دەکەینەوە بۆ ئەوەی کە گرنگێتی هەریەکەیان بەجیا دەربخەین .

وە دەرخستن و ڕوونکردنەوەی ئەم بوار و حاڵەتانە پێویستی بە درێژە پێدان وشرۆڤەکردنێکی زۆر هەبە ، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها ئەوەمان بەسە کە هەندێ لەو نیشانە و شێوە گرنگانەی کە وای لە ئافرەت کردووە متمانە بە خودی وون بکات ، ئەو حاڵەیە کە وای لێکردووە کە نێوان خودی خۆی و نێوان هەستی خۆی بە بەدیهێنانی خودیدا جیابکاتەوە لەیەکتر.

و لێرەدا ئاماژە دەدەین کە گرنگی دانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بە و فاکتەرانەی کە وا لە ئافرەت دەکات هەست بکات بەوەی کە نەتوانێ خودی خۆی بەدیبهێنێت ئەم ئامانجی بریتییە لە قەوارەگیر کردن و دیاریکردنی بوار و ماوەکانی ناڕەحەتیەکانی ، ڕووداوەکانی ئەو دڵەڕاوکێ وتێکچوون وتێکەڵکردنەی کە ئافرەت تیایدا دەگوزەرێنێ زۆر و فرە لایەنن ، بەڵام ئێمە لێرەدا چەند نموونەیەکیان لێ ڕوون دەکەینەوە و باسی لێوە دەکەین .




## ...ەو فاکتەرانە چین کە باڵی کێشاوە بەسەر بونیاتی فکری و کلتوری کۆمەڵگە ؟

یەکەم : نەزانی و فەراموشکردن ...ەرمان ئەوەیە کە ئیستعابی ئەوە ...کەین کە نەزانی چەند جۆرێکە ، ...ەتی بەواتا سادەکەیەوە ، وە نەزانی ...تا ئارێتەکەیەوە ، وە نەهێشتنی ...زانی سادە و سەرکەوتن بەسەریدا ...تر گرانە لە جۆری دووەمیان ، ...نکە خاوەنەکەی هەستی پێدەکات ... ئەم جۆرە نەزانیەیە یەکێکە لەو ...خصانە کە هەیەتی ، بەڵام دووەمیان ...ومەکەی هەست ناکات بە حەقیقەتی ...زنی ، ئەمەش یان لەبەر ئەوەیە کە ...ەڵگری چەندین خەیاڵ و وەهمە ...نەزانیێ کە زانستە هەیەتی، یان ...وشی نەخۆشیەیەکی سڕکردنی دەماغ ...تکدیس المعلومات -تخدیر الدماغ ) ... واتە : هەڵگری میکرۆبێکە کە ...ی ئیدەکات نەتوانێ زانیارییەکانی ...گۆڕێت بۆ پرۆگرامێکی تەتبیقی ، ...ەروەها دەبێتە هۆی چەند قەیرانێکی ... و زیاتر مەترسیتر لە نە بوونی ...یاری ، بە وەدەستهێنانی ئەم ...زیاندی کە بەتاڵکراوەتەوە لە ...کیەکانی دەگاتە جیاوازییەکی ...خزبی کە دەرئەنجامەکەی بریتییە ...نەمانی متمانە بەخۆتی خۆی و ...ستەکەی وە ئیتر خەیاڵ زاڵ دەبێت ...ێدا کە رای لێدەکات ببێتە ...مرازێك بۆ خزمەتکردنی هەواو ...زێی و وە ملکەچی غەیری خۆی ...بێت .

جا وێنەی ئەم نەزانە جیاوازی نێوان ...نین وحەقیقەتی زانستی تێدا وون دەبێت ، وە لەبیری دەیچێتەوە کە زانست بریتییە لەوەی کە لەپێناویدان دەنێن بە بەندایەتی کردنی بۆ پەروەردگار و دەستەمۆکردنی گەردوون بۆ ئەدای پەیامەکەی ، ئەمەش لەپێناوی بەدەست هێنانی کارت یان بڕوانامەیەك نییە کە بتوانێ لەسەری کۆپی بکاتەوە چەندین کۆپی لەبەر بگرێتەوە لەکاتێکیشدا خاوەنەکەی دەبەستێتەوە بە زانستەوە بەهۆی داوێکی زۆر لاوازەوە کە زۆر زوو پەیوەندی بە پەیمانگەکانی توێژینەوەوە دەپچڕێنێت ، هەروەها لە زانست دەردەچێت بەبێ ئەوەی کە ئەو زانستە تێبگات وهەرسی بکات تاکو پێی تێربێت عەقڵ وهزری پێتێربکات یان لە سلوکیدا ڕەنگ بداتەوە .

وە لەم جۆرە نەزانینە ئارێتەیە یە کە دەبێتە هۆی ئەوەی بدزرێتەوە بۆ خودی ئافرەت لەم ڕۆدا ، ئەو ئافرەتە تەوحی ئەوەی هەیە کە بتوانێ بڕوانامەیەك بەدەست بهێنێت کە کۆمەڵگە بەهەندی بگرن و چیتر لێپسراوێتیتی بەلاوە گرنگ نییە و گرنگی پێ نادات ، وە زۆرجاریش هانی جولانەوەی ئەوەدەدات کە پێش نەکەوێت و نەڕوات بەرەو پێشەوە ، بەڵکو چوون بۆدواوەی بەلاوە ئاسانتر بێت .

کچی ئەمڕۆ زۆر بێئاگایە لە سروشتی ڕۆڵی وپەیامی خۆی لە سەرپەرشتی کۆمەڵگادا وە نەخشەو پلان دارێژێت ( ئەگەر دایڕێژێت ) بۆ ژیانی بەبێ گوێدانە تواناکانی و ئامانجەکانی ، بەڵام سروشتی ژیان ئەم بەرەبەرکانێیە ڕەت دەکاتەوە وە واقیع خۆی دەکێشێ بەچەندین زیانمەندی لەکاتێکدا کە ناتوانێت ئەو بنەمایانەی کە بونیاتی ناوە لە سەربنەمایەك لە خەیاڵ و وەهم بەدی بهێنێت هەروەها توشی نائومێدییەك دەبێت کە نارەحەتی دەکات بەوەی کە هەست دەکات بەنەتوانایی بەدیهێنانی خودی خۆی .

دووەم : ئێمە لێرەدا باس لە بیرۆکە هاوردەکان ناکەین لەکاتێکدا ئەو جۆرە بیرۆکانە بۆمان هاوردە بکرێن لە ڕێگەی غەزویەکی فکری توندەوە ، بە چەندین جۆر شێوازی ئاشکرا و پەنهانی ، یاوەخود ئێمە بە ئارەزوی خۆمان بە زۆرلیکردنمان ئەو بیرانە هەڵدەبژێرین و هاوردەی دەکەین لە دەرەوەی چوارچێوەی فکری و کلتوری خۆمانەوە وە ئەو بۆشاییەیانەی پێپڕدەکەینەوە کە پێویستە پڕبکرێنەوە ئیتر بەهەر شتێك بێت ، لەگەڵ ئەوەی کەمزۆرێك لەم بیرۆکە هاوردانە ناتوانرێ لەگەڵیدا بژین وبەشێوەیەکی ئیجابی کارلێکی لەگەڵدا بکەین لەگەڵ بیرۆکە سائدەکانی تردا جا لە دەرئەنجامی ئەم تێکەڵکردنە نا چونیەکدا چەند نەزانین و نەخۆشی یەکی گەلان تر دەردەچێت کە تێیدا گۆشە بینیی ڕامان ودۆش دامانی نەتەوەکان زیاتر دەکات کە ئافرەتیش بەشێکە لێی ، وە ئێمە لێرەدا ئاماژە دەدەین بەوەی کە نشوستی هێنانی بیرۆکە هاوردەکان دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لەم دوو فاکتەرە ، یان ئەوەتا ئەو بیرۆکانە هیچ سەرکەوتنێکیان لەسەر ئەرزی واقیعدا بەدەست نەهێناوە دەست بەجێ ڕووبەڕوی هەرسهێنان بوتەوە وبە ڕاگەیاندنی مردنی ئەو بیرۆکەیە و گۆڕینی بە بیرۆکەی نوێ ، کە وونبوونی لە سەر پانتایی بیرۆکەکان وای کردوە کە نێوان ئێمە و نێوان ئامادەبوونی کەژاوەی تەرمەکەی لێك دابڕاوە کە وای لێکردووین بە هەوادری بەرامبەری بمێنینەوە ، یان ئەو بیرۆکانە بوتاو ژینگە و کەش هەوای بنەڕەتییەکی خۆیان بەسودن کە تێدا دەورە دراوە بە چەندین تۆڕی پەیوەندی یەدە وکە لێیەوە خۆراکی پێدەدرێت ودەپارێزرێت ، بەڵام لەناو ژینگەیەکی نویدا دەگۆڕێت بۆ بیرۆکەیەکی مردوو کە بێبەشە لەهەر بنەمایەکی سەرەکی ژیانی ئەو بیرۆکەیە .

# خوێندنەوەی کتێب



**ناوی کتێب: الخلفاء الراشدون بين الأستخلاف والاستشهاد**

**نووسینی: د. صلاح عبدالفتاح الخالدی**

**چاپی: یەکەم ١٤١٦ك - ١٩٩٥ز**

**خوێندنەوەی: ئارام عەلی سەعید**

**قەبارە: ٢٩٦ لاپەڕە**

زۆر لەسەر مێژووی ئیسلامی وتراوەو پەرتوك و کتێبێکی زۆر لەنێو کتێبخانەکاندا هەیەو پانتاییەکی زۆریان داگیرکردووە، بەڵام ئایا دەبێت کامەیان سەرچاوەیەکی ڕەسەن و مەعریفی تەواو بێت! دیارە زۆر دەگمەن و کەمن، ئەم کتێبەش یەکێکە لەو سەرچاوە بەپێزانەی لاپەڕەکانی بەتێکڕایی دابەشبوون بەسەر چەند بەشێکدا دابەشبوون بە (القبسة) ناوزەد کراون. ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە تاوەکو ئێستا بەدواداچوونم کردبێت لەسەر مێژووی ئیسلام بەگشتی و چوار خەلیفەی بەڕێز (الخلفاء الراشدون) بەتایبەتی هیچ نووسراوێکم نەبینیوە بەم شێوەیە کەبەکورتی و بەڵگەو شاهیدەکانیەوە باسی ئەو مێژووەمان بۆ بکات کەلەم کتێبەدا ئاماژەی پێکراوە، منیش زۆر بەجێگای بایەخم زانی خوێندنەوەیەکی خێرا ئەنجام بدەم بەلاپەڕەکانی ئەم پەرتووکەدا تاوەکو ئەوەی ئەمڕۆ پێی ئاشنا بن و ببێتە جێگای سوودمەندیان. ئێستاش بەپێی بەدوای یەکداهاتنی هەریەك لەو بەشانە لەپێشەکی (مقدمة) وە خوێندنەوەیەکی خێرا بەلاپەڕەکانیدا دەکەین.

**پێشەکی:**

وەکو سوودوەرگرتن لەمێژوو وەك خوێندنەوەو پێداچوونەوەی ڕووداوو بەسەرهاتەکانی مێژوو و نووسەر لەدەستپێکی ئەم کتێبەدا باسی گرنگی و بایەخی مێژوومان بۆ دەکات بەتایبەتی مێژووی ئیسلامی کە دەڵێت: (خوێندنەوەو دیراسەکردنی مێژووی ئیسلامی لەماوەی (١٤) سەدە فەرمانڕەوابییدا دەوڵەمەندو تاوەدانە بەچەندین بەڵگەو وانەو خوێندنەوەی بەسوودو پەند وەرگرتن کەئەویش مێژووی مسوڵمانانەو بەتاك و بەکۆمەڵەوە دروستیان کردووەو تێیدا ژیاون بەلایەنی باش (ایجابی) و خراپ (سلبی) کەئەمەش هەژمار ناکرێت بەمێژووی ئیسلام موتڵەقەن و ئیسلامی بەخراپەپێلەکەدار بکرێت. چونکە (ئیسلام خۆی بەرنامەیەو ناتوانرێت هەموو مێژووی مسوڵمانان لەسەر مێژووی ئیسلام بنیات بنرێت) پاشان بۆ ڕوونکردنەوەو زیاتر قووڵبوونەوە لەوەی باسمان کردن نووسەر لێرەداو لەم پێشەکییەی باسمان کرد جیاوازی نێوان مێژووی ئیسلام (تاریخ الأسلام) و مێژووی مسوڵمانان (تأريخ المسلمين) مان بۆ دەکات و دەڵێت: (مێژووی مسوڵمانان ئەوەیە کەمسوڵمانان ژیانیان تێدا گوزەراندووەو ڕووداوەکانیان دروست کردووە چ کۆمەڵ بێت چ تاك چ وەك حکومەت بێت چ وەك دەوڵەت چ حاکم بێت چ مەحکوم.. کەواتە مێژووی مسوڵمانان بۆ ماوەی (١٤) سەدە لاپەڕەی سپی تێدایە کەجێگای شانازییە، پاشان لاپەڕەی ڕەشیشی تێدایە، هەروەها لایەنی چاکەو خراپە هەیە کەدیارترین نموونە سەردەمی مسوڵمانانی ئەم چەرخەیە..) پاشان سەبارەت بەمێژووی ئیسلام دەڵێت: (مێژووی ئیسلام بریتی نییە لەهەموو مێژووی مسوڵمانان چونکە لاپەڕەی ڕەش و خراپەکاری تێدا نییە. هەربۆیەسەردەمێکە کەمسوڵمانان بەعیززەت و بەهێزو بەتواناییەکی پابەندەوە بەئیسلام تایبەت تێیدا ژیاون. وە مێژووی ئیسلام هەمووی لاپەڕەی سپی پرشنگدارە کەپەیوەستی بەردەوام و تەواوی مسوڵمانان لەو دەمە:! بەئیسلامەوە ڕاگەیەنراوە..) جێگای خۆیەتی سەرەتای نووسینی هەر مێژوویەك بەتایبەت مێژووی ئیسلام کەئەمڕۆ ناحەزان بەدوای کەم وکورتی و لایەنە لاوازەکانیدا دەگەڕێن بۆئەوەی بیشێوێنن، چەندین بوهتان و درۆی نابەجێی بۆ هەڵدەبەستن. لەم سەرو بەندەشەوە ئەگەر بەچاوی ژیری بڕوانینە ئەم دەستپێکە دەتوانین بڵێین ئەمە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی ڕەخنە لەئیسلام دەگرن و سەردەمێکی فەرمانڕەوایی مسوڵمانان لەسەر ئیسلام دەکەن بەماڵ و تەعمیمی دەکەن کە دەڵێن فلانە خەلیفە وای کردو فلانە والی وای کرد. و فلانە کەس خۆ ئیسلام بوو، کەواتە هەموو مێژوویەکی مسوڵمانان ناتوانرێت پێی بووترێت مێژووی ئیسلام، بۆ ئەمەش پێویستە ئەو دوو چەمکە تێکەڵ بەیەکدی نەکرێن.




# خولەفای ڕاشیدون

## لەنێوان فەرمانڕەوایی خەلافەت و پلەی شەهادەتدا

## (الخلفاء الراشدون بين الأستخلاف والاستشهاد)

نوسەر لەسەرەتاوە بەهێنانەوەی گوتاری خوایی زەمەنی خولەفای ڕاشیدون بەعززترین و بەرزترین زەمەن ناوزەد دەکات (وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ) (التوبة: من آية ١٠٠)، پاشان گوتاری پێشەوا محمد ﷺ دەهێنێتەوە کەلەسەردەمی خۆیدا ئاماژەی زەمەنی ئەو دەسەڵاتە کردووەو پاشان دەفەرموێ: (دوا بەدوای ئەو پاشایەتی سەرهەڵدەدات، واتە حوکمی (بني أمية) (الخلافة بعدي ثلاثون سنة ثم تكون ملكا).. چەند مەندی ئەم بەشەدا پوختەیەکی سەرەتای دەست بەکاربوونی ئەو خەلافەتە دەخاتەڕوو لەگەڵ هێنانەوەی بەڵگە سەلمێنەرەکان و سەرجەم ئەو ڕووداوو کارەسات و کەندو کۆسپ و ... تە جۆراوجۆرانەی کەئاستەنگی دروستکرد بوو وەکو ڕێگرێك لەبەردەم هەڵبژاردنی ئەو جێنشینە (خەلیفە)یەك لەدوای یەکەکاندا لەدروستبوونی سەبەئیەکان و سەرهەڵدانی خەوارج و ئەوانەی دژی بانگەوازو پرنسیپەکانی ئاینی ئیسلام بوون تاوەکو ... زەمەنەی ئیمامی (حەسەنی کوڕی عەلی - ڕەزای خوای لێ بێت -) تەنازولی ... کورسی دەسەڵات کرد بۆ موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان - خوا لێی ڕازی بێت - لەم ... گایەشەوە ئەگەر پوختەی حوکمی خەلیفە بەڕێزەکان بەخێرایی بزانرێت بەپێی ... مەندی و بەدوای یەکدا هاتن شارەزایی و زانیارییەکی تەواو وەدەست دەخات وەکو ... تەیەکی مێژوویی.

### بەشی یەکەم (القبسة الأولى)

### نەخۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ و وەفات کردنی.

### (مرض رسول الله ﷺ ووفاته)

هەر لەیەکەم چرکساتی وەدەرکەوتنی نیشانەی نەخۆشی و ئازار لەجەستەی پیرۆزی پێغەمبەری خوادا یەکەمین هەوڵ و خەمخۆری بریتی بوو لەئاماژەکردن بەهەڵبژاردنی خەلیفەیەك لەدوای خۆی، تاوەکو مسوڵمانان ئەگەر بۆ چەند ساتێکیش بووە بەبێ خەلیفە نەبن ئەمەش هەموو ئەو دەست نیشان کردنانەی کەمەبەستی پێی بوو تێگەیشتنی هاوەڵە بەڕێزەکانمسوڵمانانی لەپێش چاو بوو.. لەم چەند لاپەڕەیەدا زۆر ... ی ئازارو نەخۆشی پێغەمبەر ﷺ لەپاش حەجیماڵئاوایی (حجة الوداع) بەبێ ... کورتی دەخاتە ڕوو تاوەکو ئەو چەند ڕۆژەی نەخۆشیەکەی و پاشان وەفاتکردنی.. ... زۆر گرنگەو لەم بەشە (٢٢) لاپەڕەییەدا دەبێتە جێگای بایەخ و سەرنج ڕاکێشانی ... خوێنەرێك یاخود ئەوەی بیەوێت لەو کاروانە مێژووییەدا بەئاگا بێت هۆکاری ... بوو ئەو خەمخۆری و بەتەنگەوە بوونەی دەست نیشان کردنی ئیمامێکە بۆ مسوڵمانان ... کو ئوممەتی ئیسلامی پارچە پارچە نەبێت. لەکاتێکدا چەند جارێك ئەوەی ... یویست لەپاش خۆی ببێتە جێداری بریتی بوو لەئیمامی (ئەبوبەکری صدیق - خوا لێی ڕازی بێت) بەداخستنی هەموو دەرگای ماڵی هاوەڵە بەڕێزەکان جگە لەماڵی ... بەکر لەسەر مزگەوتەکە پاشان لەکاتی نەخۆشیەکەیدا بەکردنە ئیمامی نوێژو پاشان ... خستنی ڕێزلی ئیمامی ئەبوبەکر لەڕۆژی مسوڵمان بوونی و لەکاتی کۆچدا کە هاوڕێی ... کەوت بوو.. ئەمانە هەموو ئاماژەکردنی پێغەمبەری خوا بوو بەشێوەیەکی ئاشکرا ... هەڵبژاردنی خەلیفە ئەبوبەکری صدیق. لەم بەشەدا زۆربەی ئەو سەرچاوە مێژووییە ... کەبوختان و قسەی ناڕەوا سەبارەت بەو زەمەنە دروست دەکەن هەموویان بەدرۆ

(نص)ەکان لەفەرموودەکان و لەوتەی هاوەڵەکان سەرچاوە ناڕاستەکان بەدرۆ دەخاتەوە.. پێم وایە جگە لەسەرچاوە ئیسلامییەکانی ئیمامی (ابن كثير وطبري و کتێبەکەی ابن العربي) وەکو کتێبێك کەتەنها باس لەو بابەتە بکات، ئەم کتێبە باشترین و ناوازەترین کتێبی مێژووییە لەم زەمەنەدا بۆئەوەی تەقەلای پێزانینی ئەو مێژووەی هەبێت.

### بەشی دووەم (القبسة الثانية)

### ئەبوبەکری صدیق - خوا لێی ڕازی بێت -

### لەنێوان فەرمانڕەوایی خەلافەت، وەفاتیدا

### (ابوبكر الصديق - رضي الله عنه - بين الأستخلاف والوفاة)

لەپاش چەند ساتێك لەکۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبوو مسوڵمانان کەوتنە خۆ تاوەکو خەلیفە دەستنیشان بکەن.. هەر لەکاتی سەرقاڵبوون بەکفن کردنی پێغەمبەری خوا مسوڵمانان لەنزیکترین کاتدا توانیان بەهەوڵی هاوەڵەکان لەکۆچکردوو (موهاجیر) و پشتیوان (انصار)ەکان بەراوێژ (شوری) ئیمامی ئەبوبەکر بەپێشەوای هەڵبژێرن.. لێرەدا ئاماژە بەبەیعەتی (عەلی کوڕی ئەبی تالب) دەکات لەکاتێکدا لەلایەن دوژمنانی (رافضة) و سەبەئیەو نەتەوەپەرست و عەلمانییەکانی ئەمڕۆشەوە بەدەربڕینی چەندین بوهتان دەڵێن ئیمام عەلی - خوا لێی ڕازی بێت - ئەوەتا باس لەبەیعەتی ئیمام عەلی دەکات - خوا لێی ڕازی بێت - کەدووجار بەیعەتی داوە دەڵێت: (فبايع علي بن أبي طالب رضي الله عنه أبابكر الصديق رضي الله عنه مرتين):

المرة الأولى: يوم الثلاثاء التالي ليوم وفاة رسول الله ﷺ حيث جاء عجلا مسرعا، وعليه قميص بدون ازار، كما روي حبيب بن أبي ثابت.

والمرة الثانية: بعد وفاة فاطمة - رضي الله عنها - حيث توفيت بعد ستة أشهر من وفاة أبيها ﷺ.



وكان علي في هذه الشهور الستة متبايعا لأبي بكر ـ رضي الله عنه ـ، لم يفارقة في وقت من الأوقات، ولم يتقطع عنه في جماعة من الجماعـات وكـان يشاركه فى المشـوره، وفى تدبير أمور المسلمين).

بـەم شـێوەیە ئیمـامی ئەبوبـەكر ـ خـوا لێـی ڕازی بێـت ـ بـوو بەیەكـەم خەلیفـەی مسوڵمانان.. بۆماوەی دووساڵو سێ مانگو دە ڕۆژ فەرمانڕانی گوزەراند.. هەر لـێرەدا باسی هەموو ڕووداوو شەڕەكەی، ئەو كاروبارانەی كەڕووبەڕووی بووەتەوە دەكات، لەدوای ئەم بەشە (٢٧) لاپەڕەیە باسـی ئـەوە دەكـات ئیمـامی ئەبوبـەكر زانـی كۆچـی دوایـی دەكـاتو وەسـیەتەكەی ئیمـام ئەبوبـەكر بـۆ ئیمـام عومـەر ـ خـوا لێـی ڕازی بێـت ـ دەخاتەڕوو، ئەمەش بەڵگەیە بۆئەوەی كەئیمامی عومەر دەستنیشان كراوە وەك دەڵێت: (یا عمر اتق الله، وأعلم أن عملا بالنهار لایقبله الله بـالليل، وعمـلا بـالليل لايقبلـه بالنهار، وأن الله لايقبل نافلة حتى تؤذي الفريضة).

بەشی سێیەم (القبسة الثالثة)

عومەری كوڕی خەتتاب ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ لەنێوان فەرمانڕانی خەلافەت، پلەی شەهادەتدا
(عمر بن الخطاب ـ رضي الله عنه ـ بين الأستخلاف والاستشهاد)

لەم بەشەدا (٧٥ ـ ١٠٢) مێژووی هەڵبژاردنی ئیمام عومەر ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەخاتەڕوو ڕاستەوخۆ هەر لەكاتی مردنی ئیمام ئەبوبەكر ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ ئەهلی حـەلو عـەقد توانیـان ئـەو ئیمامـە بـەڕێزە دەستنیشـان بكـەن، ئــەوەی بەتێڕامانــەوە خوێندنەوەی مێژووی زەمەنی عومەری كوڕی خەتتاب ـ خـوا لێـی ڕازی بێـت ـ بكـات لێـهاتویی‌و جەسـوریی عومـەری بـۆ دەردەكـەوێت، چونكـە هـەم دادوەرو هـەم بـەهێزو عیزەت، هەم جیاكەرەوەی نێوان ڕاستی (حـەق) و ناڕاستی (بـاطل) بـووە، هەربۆیـە ناونراوە (فاروق) لەدرێژەی ئەم باسەدا نووسەر دەقی یەكەم وتاری خەلیفەمان بۆ تۆمار دەكـاتو دەڵێـت: (وابتـدات خلافـة عمـر ـ رضـي الله عنـه ـ يـوم الثلاثـاء، الثـاني والعشرين من أول جمادي الأخرة، سنة ثلاث عشر، ولما بايعوه صعد علـى المنـبر، ونـزل درجة عن الدرجة التي كـان يقـف عليـها الصديـق وخطـب فقـال: اللـهم إنـي ضعيف فقوني، اللهم إني غليظ فليني، اللهم إني بخيل فسخني).

إقرؤوا القرآن أن تعرفوا بة، وأعملوا به تكونوا من أهلـه، وزنـوا أنفسـكم قبـل أن توزنوا، وتزينوا للعرض الأكبر، يوم تعضـون علـى الله، ولاتخفـى منكـم خافيـة، إنـه لم يبلغ حق ذي حق أن يطاع في معصية الله.

ألا وإني أنزلت نفسي من مال الله بمنزلة ولي اليتيم، ان ستغنيت أستعففت، وإن افتقرت أكلت بالمعروف!). لـێرەدا سـەرەتای سـەرهەڵدانی دادپـەروەری‌و خواپەرسـتی لێنەبووردەیی توندی بەرامبـەر بـەدوژمن‌و زەلیلـی بەرامبـەر بەمسـوڵمانان خـاڵی دەستپێكی ئیمام بوو لەنێوەندی دەسەڵاتی پیرۆزیدا، خـاڵ بـەخاڵی سـەردەمی زێڕینـی ئیمام عومەر لەم پەرتوكە نایابەدا خۆی بەرجەستە دەكات كەدە ساڵو شەش مـانگو چەند ڕۆژێك لە (١٣هـ) بۆ (٢٣هـ) خەلیفەی مسوڵمانان بورە، لەكۆتاییدا باسی خەوی (أبو موسى الأشعري) دەكات بەوەفاتی ئیمامی عومەرەوە پاشان چۆنیەتی هـەوڵدانی دوژمنان بۆ شەهیدبوونی ئیمام ئەوەبوو (٦) كەسە مژدەپێدراوەكانی كۆكردەوە بـەوەی پێش ئەوەی بەتەواوی بمرێتو هێشتا لەسەرەمەرگیدا بوو بەكۆبوونەوەی ڕاوێژ (شووری) خەلیفەی دوای خۆیان پێ دەست نیشان بكات، عومەر ـ خوا لێـی ڕازی بێـت ـ توانـی لەسەر ئەو كارە پێكیان بهێنێت بۆئەوەی لەدوای خۆی تووشی گرفت نەبن.

بەشی چوارەم (القبسة الرابعة)

عوسمانی كوڕی عەففان ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ
لەنێوان فەرمانڕانی خەلافەت، پلەی شەهادەتدا
(عثمان بن عفان ـ رضي الله عنه ـ بين الاستخلاف والاستشهاد)

زەمـەنی ئیمـامی عوسمـان زەمـەنێكی جودابـوو لـەوانی پێـش خـۆی، زەمـەنێكی چـاوەڕوان نـەكراو لەلایـەن مسـوڵمانانەوە. زەمەنی دروست بوونی ئاژاوەو فیتنە، زەمـەنی داڕشتنی پلانـی دوژمنـان بـۆ دروسـتكردنی دووبەرەكی لـەنێو مسـوڵماناناداو هـەوڵدان بـۆ لێكپچڕاندنـی ڕیزەكانیـان.. هەربۆیـە بوونـی سـەرچاوەی مێژوویـی ڕاسـتو دروسـتو دوور لەلادان (انحـراف) زەروورەتـی حەتمیـە تایبـەت بسـەرهەڵدانی فیتنـە لەچـەرخی ئیمـام عوسمـاندا، تـاوەكو ئـەو هـەموو پڕوپاگـەندەو بوهتانەی بـۆ حـەزرەتی عوسمـانو مسـوڵمانان هەڵدەبەسـترێت بـەدرۆ بخرێتـەوە.. لەبەشـی چوارەمـی ئـەم پەرتوكـەدا بـەپوختی زەمـەنی ئیمـام عوسمـان شـیدەكاتەوە هـەر لەیەكـەم چركەساتی سپاردنی خەلیفایـەتی بـەو هاوەڵـە ئـازیزە تـاوەكو شـەهید بوونـی لەئـەنجامی هەڵگیرسـاندنی فیتنـە.. شـیاوی باسـە لـێرەدا پاش ئـەوەی بـاس لەهـەڵبژاردنی خەلیفـەی مسوڵمانان دەكات لە (٤)ی مـەحرەمی سـاڵی (٢٤)ی كۆچیداو قورس بوونی باری سەرشانی ئیمـام بـەبوون بەفـەرمانڕانی مسـوڵمانان لەدروست بوونی فیتنەی ئـەو سـەردەمە دەدوێ لەحەوتـەمین سـاڵی دەسـەڵاتدارێتی ئیمـام عوسمـاندا لەسـاڵی (٣٠) كۆچـی‌و دەڵێـت: (اتسعت الخلافات، ونشط أعداء الأسلام في تنظيماتـهم السـرية، في البصـرة والكوفـة والمصـر.. وجيشـوا منـهم الجيـوش مـن مصـر والكوفـة والبصـرة واسـتمروا في تـأجيج الخلافات، ونشر الأكاذيب والأشاعات، حتى أذى بهم الأمر الى محاضرة عثمان بن عفان في المدينـة..)، پاشـان باسـی گرنگـترین ئـەو سـەرچاوانە دەكـات كەباسـیان لـەم ڕووداوە كردەوە وەكو: محمد بن جرير الطبري لەكتێبی (تأريخ الأمم والملوك) ابن الأثير لـە (التـأريخ الأسلام)وە هـەندێك بەتایبـەتی باسـیان لـەو ڕووداوە كـردوە لەكتێبـەكانیاندا وەكـو (ابـن العربـى المـالكى) لـەكتێبی (العواصـم مـن القواصـم) وە (محمـد الأشـعري المالكيى)لەكتێبی (التمهيد والبيان في مقتل الشهيد عثمان).

پاشان هەندێك لەکتێبە نوێیەکان هەیە لەسەر ئەو رووداوە وەکو (الفتنة الکبری)ی حسێن کەزانایان بە (زندیق الأعمی)باسیان کردووە. پاشان دێتە سەر باسی دروست بوونی فیتنەکە لەکوفەوە سەری هەڵداوە تاوەکو سەرهەڵدانی عەبدوڵلای کوڕی سەبەئی یەمەنی کەبزوێنەرو هەڵگیرسێنەری ئەو فیتنەیە بوو تاوەکو شەهید بوونی ئیمام عوسمان - خوا لێی رازی بێت - بەدرێژی باس دەکات لەدوو توێی (١٠٢) لاپەڕەدا بەجیا زۆرتر لەبەشەکانی دیکە، لێرەدا بایەخی متمانە بوون‌و گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە ئەو سەرچاوانەی پشتی پێبەستوون بریتیین لەسەرچاوە ئیسلامیەکان وەک (تاریخ الطبري) و (فتنة الکبری) روون دەکاتەوە بە بەرپەرچدانەوەی کەسانێك کەهەرۆ رەخنە لەخەلافەتی حەزرەتی عوسمان دەگرن‌و هەندێك ئیفتیرای بۆ دەکەن وەك ئەوەی دەڵێن پارەی کۆکردووەتەوەو خزمانی دەوڵەمەند کردووەو نەیتوانیوە فەرمانڕانی بکات‌و چەندینی‌تر لەو درۆیانەی کەئێستا لائیك‌و نەتەوەپەرستەکان‌و ناسۆنالیستەکان دووپاتی دەکەنەوە...

## بەشی پێنجەم (القبسة الخامسة)

## عەلی کوڕی ئەبوتالیب - خوا لێی ڕازی بێت - لەنێوان فەرمانڕانی خەلافەت، یلەی شەهادەتدا (علی بن أبي طالب - رضي الله عنه - بین الأستخلاف والاستشهاد)

سەردەمی ئەم خەلیفە ئازیزە هەر لەسەرەتای دەست بەکاربوون‌و هەڵبژاردنیەوە وەکو ئەو ساتەی گیانی سپارد سەردەمی ئاژاوەو شەڕو کارەساتی جەرگبڕ بوو لەمێژووی ئیسلامدا کەزادەو بەرهەمی ئەو فیتنە بەدو بێ چارەیەی سەردەمی ئیمام عوسمان بوو - خوا لێی رازی بێت - ئەویش بەپیلان‌و دەست تێوەردانی دوژمنانی دژ بەدینی ئیسلامی پیرۆزو مسوڵمانان.

لێرەدا پێویست ناکات لەخوێندنەوەی ئەم پەرتوکەدا باس لەچۆنیەتی ئەو هەڵبژاردنە بکەین کەئیمام عەلی - خوا لێی رازی بێت - بوو بەخەلیفە، کەلەم پەرتوکەدا تۆمار کراوە، چونکە باسکردن لەو هەڵبژاردنە لای هەموان ئاشکرایە تا رادەیەك، بەڵام ئێمە لەگرنگی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا وەك چۆن لەسەردەمی هەر خەلیفەیەکی پێشتر یاخود سەردەمی هەریەکەیان یان ناوبانگێکی تێدا دەرکراوە یاخود هەوارێك رویداوە کەبەرپوونی لەزۆر نووسراوەکانی تردا نییە، ئێمەش بەبایەخەوە چەند تێبینیێك وەردەگرین یان وەرمان گرتووە لەم کتێبەداو تێبینییەکانی لەسەر دادەبەزێنین بۆ دەرخستنی چاکی‌و بەپێزی کتێبەکە لەرووی خوێندنەوەی لاپەڕەکانیەوە.. لەسەردەمی ئیمام عەلی - خوا لێی رازی بێت - فیتنە گەورەبوو لەپاش شەهیدبوونی ئیمام عوسمان‌و گەیشت بەوەی لەنێو مسوڵماناندا خوێن رژا بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو بەدەست پێکردنی شەڕ کەبەشەڕی (الجمل) ناسرا لەساڵی (٣٦)ی کۆچی لەناوچەی (الزابوقة) نزیکی بەصرە.. شیاوی باسە سەرەتای دروست بوونی شەڕ لەنێوان مسوڵماناندا بەوردو چڕی باس دەکات تاوەکو کۆتایی شەڕی (صفین)، کەئەو شەڕە ناهەموارەش (٧٠٠٠٠) مسوڵمان تێیدا کوژرا لەساڵی (٣٧)ی کۆچی‌و ئاماژە بەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەکات کەهەواڵ دەدات بەرووداننی شەڕی (صفین) - ئەبوهورەیرە - و دەفەرموێ: لەپێغەمبەری خواوە ﷺ : (لاتقوم الساعة حتی تقتل عظیمتان متتلة عظیمة، دعواهما واحدة) ئیمامی بوخاری‌و مسلم ریوایەتیان کردووە (البدایة والنهایة/ ٧:٢٧٥).. لەپاش ئەمەو لەدوای تەواوبوونی ئەو شەڕە ناهەموارەو لەئەنجامی رێکبوونی کۆمەڵێك بەصولحی نێوان عەلی‌و معاویە - خوا لەهەردووکیان رازی بێت - (خوارج) دروست بوون، کەڕژێشتن بۆ (نەهرەوان)، پاشان شەڕی ئەوان رویدا، لێرەدا بەس لەفەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ کەسەبارەت بەکوشتاری خەواریج هەواڵیداوە دەکات، ئیمامی مسلم ریوایەتی کردووە لەزەیدی کوڕی وەهبی جوهنی کەلەسوپای عەلی کوڕی ئەبوتالیبدا بووەو دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبوتالیب پێی وتم: گوێم لەپێغەمبەر ﷺ بوو کەفەرمووی: (یخرج قوم من أمتي یقرؤون القرآن، لیس قراءتکم الی قراءتهم بشيء، ولاصلاتکم الی صلاتهم بشيء، ولاصیامکم الی صیامهم بشيء، یقرؤون القرآن ویحسبون انه لم، وهو علیهم). لێرەدا بۆ زیاتر پشت بەستن بەبەڵگەو دەوڵەمەند کردنی نوسینەکە نووسەر هەموو بەڵگەو دەقەکانی خستووەتە روو تاوەکو راستی رووداوەکە بەرروونی باس بکات، پاشان هەر سەبارەت بەم رووداوە (واتە سەرهەڵدان‌و دروستبوونی خەواریجەکان) چەندین فەرموودەی‌تر دێنێت کەپێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە تایبەت بەو رووداوانە، لەشوێنێکی‌تردا دەفەرموێ: (تمرق مارقة عند فرقة المسلمین، تقتلهم اولی الطائفین بالحق)، مەبەستی ئەوەی کەدەڵێت کوشتاریان لێدەکات‌و حەقە حەزرەتی (عەلی)یە خوا لێی رازی بێت.

بەردەوام بوونی سەردەم‌و مێژووی رووداوو هەڵبژاردن‌و کارەساتەکان، ئیمام عەلی‌و شەهید بوونی، پاشان هاتنە سەرکاری ئیمام (حسن) باس دەکات، وەرووداوەکانی ئەو سەردەمەش کەئیمام حسن خوا لێی رازی بێت سازشی کرد بۆ موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان کەبەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ (ثلاثون سنة) کۆتایی پێهات لە (١١)ی کۆچیەوە بۆ (٤١)ی کۆچی‌و (ثم تکون ملکا) دەستی پێکرد ساڵی (٤١)ی کۆچی.

تێبینی/

١-هەرچەندە خوێندنەوەی ئەم کتێبەم بینیوە لەشوێنێکی‌تر بەڵام ئەوە زیاتر خوێندنەوە لەسەر نوسخە کوردیەکەی بوو، هەربۆیە منیش کاتێك بینیم بەپێویستم زانی خوێندنەوە لەسەر نوسخە عەرەبییەکەی بکەم کەدتام و چێژێکی جیاوازتری هەبوو لەکوردیەکە.

٢-ئەم کتێبە لەلایەن نووسینگەی تەفسیرەوە بەزمانی کوردی چاپکراوەو لەبەرگی دوو توێیەکی قەشەنگدا کەوتە نێو کتێبخانەی کوردیەوە کە جێگای دەستخۆشی و نرخاندنی ماندو بونیانە.

عومەر (ئاراس)

# دەست كەوتەكانی مۆندیالی ٢٠١٠



هێمن صلاح

چی تر تۆپی پێ تەنهاوەك یاری یەكی كات بەسەربردن نەماوەتەوە بەڵكو بۆتە پیشەسازی یەكی ئابووریكە ولاتە مەزن و دامەزراوە ئابوری یەكان و بیاوانی سەرمایەدار وبازرگان كێ بركێ وپیاهەڵ دانی لەسەردەكەن . بەئامانجی بەدەست هێنانی قازانجێكی زۆرە وەلەپشت پەردەوە هەڵدەستن بە گرتنە ئەستۆی خەرجی تیپێكی دیاری كراو وەیان ڕێكخستنی پالە وانێتی یەكی وەك پالە وانێتی جامی جیهانی یان جامی نەتەوەكانی ئەوروپا یان هەر پالەوانێتیەكی ناوخۆیی .

هەربۆیە ئیتر جێی سەرسوڕمان نی یە كاتێك گوێبیستی هەندێ ژمارەی خەیاڵی دەبێت سەبارەت بە بەها و نرخی یاریزانەكان كەم دواییە دا بەرزبوونەوە بۆیتر لە ٥٠ملیۆن دۆلار ، بەڵكو ئێستا تیپیواهەیە كەبەكۆی هەمویان لاتەدات لەملیارێك دۆلار وەك یانەی ڕیاڵ مەدرید لەئیسپانیا و مانشستر یونایتد لەئینگلترا و بایرمیونخ لە ئەڵمانیا ........هتد

وەلەم كاتەدا یەكێتی تۆپی پێ ی جیهانی (فیفا) رووی‌كردە كیشوەری ئەفریقا بۆ ڕێكخستنی جامی جیهانی بۆسالی ٢٠١٠ ئەمەش بۆجاری یەكەمە لەمێژووی‌ئەم پالە وانێتی یەدا.

هەنگاوێكی گرنگە كەتێیدا لەرێگایەوە ئەو وولاتانەی كەكێبڕكێیان كردبوو لەسەر میواندارێتی ئەم پالە وانێتی‌یەكە ئەوانیش (میسر و لیبیاوتونس و مغرب وباشوری ئەفریقا ) كە ئابوریەكانیان ببوژێتەوە وە بەشێوەیەكی كاتی چارەسەری هەندێ لەقەیرانە ئابوری‌یەكانیان بكات ، جا بزانین ئەو دەسەكەوتانە چین بەدەستی دێنن لە پشت ئەو پالەوانیەتیانەوە ؟

## تۆپی پێ یان دۆلار ؟

دەسكەوتە ئابوری‌یەكان لە پشت ڕێكخستنی جامی جیهانیەوە دەكرێت بە دووبەشەوە ، یەكەمیان دەسكەوتێكی راستەو خۆیە و پەیوەنداره بە قازانجی كوتایی یەوە كە دەوڵەت بۆخۆی دادەپچرێت ئەویش لە دەرئەنجامی ئەو خەرجی‌یانەی‌كە دەیكات بۆ پالەونێتیەكە . وە جۆری دووەمیان بریتی‌یە لەو دەسكەوتە ناراستەو خۆیانەی كە لە دەرئەنجامی بونیات نانی ئەو موتێل و دامەزراوە و كافتریا و شوێنی حەوانەوانەی گەشتیاری‌یانە وكەرتی خواردەمەنی ... هتد كە دەیكاتەوە بوئەومەبەستە و كە لەپاشانیشدا بوی دەمێنێتەوە و بۆماوەیەكی درێژ خایەن و بەردەوام سودەمەند دەبێت لی‌ی كە چەند جارەی دەسكەوتە راستەوخۆكان دەبێت .



بۆنموونە كۆریا ویابان كە میواندارێتی جامی جیهانی سالی ٢٠٠٢ یان كرد نزیكەی ٤ ملیار دۆلاریان وەك دەسكەوتی راستەوخۆ بەدەست هێنا ، وەچەند مەزەندەكردنێكی نافەرمیش هەیە كە ئاماژە دەات بۆ بڕ و قەبارەی دەسكەوتە ناراستەو خۆكان بۆسەر ئابووری وولات وە واش پێشبینی دەكرێت كە لە ئەڵمانیادا بۆ جامی ٢٠٠٦ نزیكەی ٦ ملیار دۆلار دەسكەوتی دەبێت لەبەرامبەر بودجەیەكی پێشبینی‌كراودا لە كاتی ئەو جامەدا كە لە سنوری ٦٠٠ ملیۆن دۆلاردا دەبێت .

وە ئەو وەبەر هێنانەی كە پێویستە بۆ ئامادەكاری ڕێكخستن ومیواندارێتی جامی جیهانی وەكو چاكسازی یاریگاكان و و دامەزراندنی دامەزراوەی تایبەت بە وەفدە وەرزشیەكان و سەیركەران ... هتد .

## چەند دەروازەیەک

**قازانجەکان لە رێکخستنی پالّەوانێتی‌یەکانی جامی جیهانی لە رێگەی چەندین دەروازەوە وەدەست دەهێنرێن لەوانە**

- فرۆشتنی مافی پەخش کردنی تەلەفزیۆنی بۆ کۆمپانیا جیهانی‌یەکان
- ئەو برە پارانەی کە بریکارەکان دەیدەن بۆ رێك خستنی پالّەوانێتییەکە
- ئەو پەیماننامانەی کە کۆمپانیاکان پێشکەشی دەکەن بۆ پروپاگەندەی بەرهەمەکانیان لەکاتی یاریەکاندا .
- بەرزبوونەوەی رێژەی کارکردنی هۆتێلەکان و بەرزبوونەوەی ئاستی گەشەکرایی پەرەسەندنی گەشتیاری .
- بلیتی یاریەکان کەهەندێ جار لە هەزار دۆلار تێ دەپەرِدەکات .

مافەکانی پەخش کردن و ئەوەی پەیوەندی دارە بەوەوە جگەلە رێگەیەك بۆبەدەست هێنانی قازانجێکی گەورەتر و دەستکەوت و قازانجێکی مالّی زۆر مەزن زیاتر هیچی ترنییە .

پەخشی تەلەفزیونی‌یەکی بۆ هەرێمی خۆی داواکراونی یە ، بەلّکو هەمیکە بۆ زیاتر بەدواداچونێکی وەرزشی‌یە کە باشترین رێگە یە بۆ بەستە بەسەرکردنی کەنالێکی تەلەفزیۆنی دیاری کراو بۆپروپاگەندەی بازرگانی یەکان .

هەروەك چۆن یەکێتی‌یە وەرزشی و نیشتیمانی و جیهانی‌یەکان داهاتێکی مالّی زۆر دەستەبەردەکەن بۆ خۆیان لەرێگەی بەکارهێنانی یاری‌بە وەرزشی‌یەکان و ئەستێرەی پالّەوانێتی یە جیهانی یەکان و جل وبەرگی ئەستێرەکانی وەرزشی و چەندین رێگەی ترەوە بۆ بەستنی چەندین صەفقەی پروپاگەندەی بازرگانی و لەلایەکی ترەوە پالّەوانیتیەکانی جامی جیهانی چەندین گرێ بەستی کۆمپانیا وەرزشیەکان دەبینێت بەخۆیەوە بەتایبەتی لەدروست کردنی جل وبەرگ وکالە وتۆپ و پێداویستێکانی هەلّبژاردەکان ویاریزانەکان و یاری‌یەکان ...هتد بۆنموونە کۆمپانیای ئەدیداسی ئەلّمانی کۆمەکی جامی جیهانی دەکات بە پێدانی نزیکەی ٢٠٠٠ تۆپ بو " ٦٤ " یاری و مە شق کردنی هەر ( ٣٢ ) هەلّبژاردە بەشدار بووەکە ، هەروەها هەلّدەستێت بە پێدان و ئامادەکردن و کۆمەکی کردنی( ٩) هەلّبژاردە بۆ ئەم پالّەوانێتیە کە ئەوانیش هەلّبژاردەکانی ( فەرەنسا ، ئەرجەنتین ، چین ، یابان ، رومانیا ، ئەلّمانیا ، باشوری ئەفریقا، ئیسپانیا ، تورکیا ) ن وە بەپێی گوتەی کۆمپانیاکە خۆی لە موتدیالی " کوریا ویابان" دا نزیکەی " ٤٠٠ " ملیۆن دۆلاری دەسکەوت بووە .

## ئەفریقا و جامی جیهانی

پێنج ولاتی ئەفریقی لەدوای پاشەکشێ کردنی نێجیریا کێبڕکێیان کرد لەسەر بەدەست هێنانی شەرەفی رێکخستنی جامی جیهانی ٢٠١٠ ، وە بۆزانینی ئەندازەی ئەو سود وەرگرتنەی کە دەگەرێتەوە بۆ ئەو ولاتەی‌کە لە کاتی سەرکەوتنی بە لە ئەستۆگرتن و رێکخستنی پالّەوانیەتێکە ، وا لەخوارەوە بە وردی باسی لێوە دەکەین .

### ١ - میسر :

پێشبینی دەکات کەتێچوونی خۆسازکردن وئامادەکردنی بۆ رێکخستنی جامی جیهانی ٢٠١٠ بەپێی ئەو ژمارە و خەملاّندنانەی کە لە دۆسیەی میسردا هاتوە وخراوەتە بەردەم فیفا نزیکەی ٨٦٥ ملیۆن دۆلار دەبووکە ژێرخانی ئابوری دەگرێتەوە وەك ئامادەکردنی یاریگاکان وە ئامادە وسازدکردنی پێداویستی‌یە تەکنیکی و تەکنەلۆژی‌یەکان وەك هۆلّی ئیعلامی و ئامێرەکانی پەخش و پەیوەندی یەکان و سەرەرای دابین کردنی تێچونی رێ وشوێنی ئەمنی یەکان .

بەلاّم دەستکەوتی راستەوخۆ کە هەندێك پێشبینی دەکات کە قازانجی صافی میسر بگاتە یەك ملیار دۆلارجگە لەو دەست کەوتانەی کە کەرتی گەشتیاری کە لە هەردوو ماوەی دورر و نزیك دەستی دەکەوێت .

میسریەکان بەگەل وحکومەتەوە هیوای ئەوەیان دەخواست کەمیسر ئەم پالّەوانیتی‌یە رێکبخات تاکو بتوانن بیکەنە دەروازەیەکی دەرچونیان لەو قەیرانی ئابوری‌یەی کەچەند سالێکە روبەروی بوونەتەوە ، کە دیاترین نیشانەی بریتی‌یە لە دەست دانی چارەکی بەهای دراوی نیشتیمانی‌یان لەو کاتەوەی کە حکومەت لە" ٢٨ نیسان ٢٠٠٣ "دا بریاری دا بەوەی کە نرخی دراو ئازاد بکات (تحریك سعر الصرف )بەمەش کۆی دابەزینی جونەیی میسری لە جێبەجێ‌کردنی ئەوسیاسەتەیەوە لە ئاب / أغصطس ی ٢٠٠١ دا گەیشتە ٨٠٪ .




وەمیسر خاوەنی چەندین بنەمای ئابوریە کە هۆکارێکی کۆمەکی و بەهێزکردنی دۆسیەکەی دەکرد لەجامی جیهانی دا، کە لە سەرو هەموویانەوە پێگەی جوگرافی و ناوراستیتی لەنێوان کیشوەرەکاندا وەبوونی ژێرخانێکی گونجاو بەتایبەتی لە هەریەك لەشارە سەرەکی یەکانداوەك ( قاهیرە ئەسکەندەریە ...) هەروەها میسر خاوەنی چەندین ئەزموونە کە شایەنی باسکردن بێت لەبواری ڕێکخستنی پاڵەوانێتی گەورەدا وەك " خولی یاریەکانی ئەفریقا لەساڵی ١٩٩١ دا ، وە پاڵەوانێتی جامی جیهانی بۆ تازە پێگەیشتوان لە تۆپی پێدا لەساڵی ١٩٩٧ ، وە پاڵەوانێتی جیهان بۆ تۆپی دەست لە ساڵی ١٩٩٩ دا .

بەلام ئەوەی کە خاڵی لاوازی بێت لای میسریەکان بریتی بوو لە قەڵەباڵغی و چڕی دانیشتوانیان و بەرزی ئاستی پیسی ژینگە بەتایبەتی لە ( قاهرە ) ی پایتەختدا کە نزیکەی ( ١٥ ملیۆن ) سەرنشین لە قاهیرەدا نیشتەجێن و کە خۆی کۆی ژمارەی دانیشتوانی میسر( ٧٠ ملیۆن ) کەسە ، ئانەم خاڵەش بور کە بوە هۆی دورخستنەوەی دۆسیەی میسر لە کێبڕکێی خۆ کاندیدکردنیدا بۆ میوانداریتی کردنی خولی ئۆلۆمپیادی ساڵی ٢٠٠٨ .

٢ - مەغریب :

بەپێی لێدوانەکانی سەرۆکی لیژنەی لێپرساو ی پشتیوانی کەری مەغریب بۆ ڕێکخستنی جامی جیهانی بۆ ساڵی ٢٠١٠ ( سعد کەتتانی ) کە ئەو برە پارەیەی کە ولاتەکەی تەرخانی کردبوو بۆ میوانداریتی ئەو پاڵەوانێتیە نزیکەی ( ٦٥٠ ) ملیۆن دۆلار دەبوو کە بەشێکی لێ تایبەت دەکرا بۆ تەواوکردنی یاریگای تەنجە و مەراکیش کەلە سیبتەمبر / ئەیلولی ٢٠٠٣ وە دەست کراوە بە دروستکردنی ، هەروەها بۆ دەستپێکردنی دروستکردنی یاریگای ئەغادیر لە کاتێکدا گەر " فیفا " ڕەزامەندی دەر ببڕیایە لەسەر ئەوەی کە مەغریب میوانداریتی ئەو جامە بکات .

بەلام یاریگا ئامادەکان ژمارەیان گەیشتبووە شەش یاریگا کە زوربەیان لەگەڵ مەرجەکانی " فیفا " دا جونیەك بوون و دەگونجان وە لە نێوانیان ئەو یاریگایانەدا یاریگای ( فاس ) ە .

وە مەغریبیەکان زۆر گەش بینن بۆ سەرکەوتنیان لەو کێبڕکێیەدا ،کە لەدەرئەنجامیدا یەك ملیار دۆلار دەچێتە سەر ئابووری ولاتەکەیان ، ئەمەش بۆ هاریکاریەکیانە گەر بەشێوەیەکی کەمیش بێت لە و ڕێژەی بێکاری یە کە لەناوبانداییە کە دەگاتە ١٩٪ وە ڕێژەی هەژاریش دەگاتە ١٩٪ بەپێی سەرژمێریە فەرمی یەکان .



٣ - لیبیا و تونس :

هەر دوو ولات ڕێکەوتبون لەسەر ئەوەی کە یەك لیستی هاوبەشیان پێشکەشی فیفا کردبوو بۆ ڕەزامەندی نیشاندانی فیفا لەسەر ڕێکخستنی جامی جیهانی ٢٠١٠ لە هەردوو ولاندا، ئەمەش لەدوای ئەوەی کە لەپێشدا لیبیا ئەم بیرۆکەیەی ڕەت کردەوە، وە رای گەیاندبوو کە لیبیا(١٤) ملیار دۆلار تەرخان دەکات بۆ خەرجی ئەو پاڵەوانێتیە ، سەرەرای ئەوەی کە داهاتی پێشبینی کراو بۆلیبیا کەمتر دەبوو لە تێچوونەکەی ، بەتایبەتی لەکاتی ئەوەی کە ژێرخانی سەرەکی زۆر لاوازە ( یاریگاکان و پێداویستی یەکانی تر ) بۆ میوانداریتی ئەو پاڵەوانێتیە گەورەیە ، پێدەچێت ئامانجی سیاسی پێشی ئابووری کەوتبێت سەبارەت بە لیبیا کە دەیەوێت هەڵی ئەوەبقۆزێتەوە کە لە ڕێگەی ڕێکخستن ومیوانداریتی جامی جیهانیەوە سومعە و ناوبانگی خۆی پێ باش بکات و ئاوێتە بوونی لەگەڵ کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتیدا بسەلمێنێت لە دوای ئەوەی کی سزاکانی لەسەر هەڵگیراوە لە سیبتەمبر / ئەیلولی ساڵی ٢٠٠٣ وە .

وە سەبارەت بە تونس ئەو خاوەنی ژێرخانێکی گەورەی گەشتیاری و وەرزشی باش بوو، کە چەندین پاڵەوانێتی ڕێك خستووە ، وە دواین پاڵەوانێتیش کە لە ئەڵمانیای دابچڕی بۆخۆی ئەویش پاڵەوانێتی جامی جیهانی تۆپی دەست بوو بۆ ساڵی ( ٢٠٠٥ ) .




ـ؛ میواندرێتی کردنی جـــامی ـەوەکانی ئـــەفریقا بـــۆ دووجـــار ـــالانی ( ١٩٦٥ و ١٩٩٤ ) وە ـاریش یاریـــەکانی دەریـــای ـڕاســتی ئـــامێزگرتووە لـــەسالانی ١٩٦٢ و ( ٢٠٠١ ) دا ، وە ئـــەوەش ـیاد ئەکرێت کە تونس پێگەیـــەکی ـوگرافی نزیکی هەیە لـە ئـــەوروپا و ـەریای ناوەڕاســـتەوە ، ـەروەها هـــێزی زۆری ـووری هەیە ، کە تێکرایی ـشـەکردنی ئـابووری لـــە ـدا دەگاتـــە ٥,٥٪ لـــە ـالی ٢٠٠٢ دا ئەمـــەش ـی ژمارە فەرمییەکان ، ـ ئەم مۆتدیالـە داهـاتێکی ـیـی زۆری دەســـتەبەر ـکرد بۆ سەدەها هەزار هەل ـۆ چارەسەرکردنی قـەیرانی ـتـە کە ڕێژەکـەی گەیشـتوتە ٤٠٪ ـی مەزندە کردنە نا حکومیـەکان ـ سالی ٢٠٠٢ کە ئەمەش ڕێژەیەکی ـ بەرزە .

## ٤- باشووری ئەفریقا

سەبارەت بـە باشـوری ئـەفریقا زۆر ـیکـتر بـووە لـەوەی کـە ئـەمیان ـەتبستێت بە میوانداری ورێکخستنی ـامی جیهانی ٢٠١٠ ، ئەمەش تەنـها ـەر ئەوەی کە شارەزاو پسپۆڕ بوو لـە ـێشکەشکردنی داوای بەدەستهێنانی ـافی میوانداریتی ئەم پاڵەوایەنتیە نا ـەڵکو بەهۆی ئەو توانا ئابوورییـەی کە ئەم وڵاتە پێیەوە تایبەتمەند بوو .

وە هەرلە سەرتاشەوە بـڕوا وابووکـە ئـەم وڵاتــە لەپێشــتر و شـیاوترە بـــە میوندارێتی‌کردنـی ئــەو مۆتدیالەکــە لەسەر خاکی کیشوەری ڕەش پێستەکان بۆجاری یەکەم ئەنجام بدرێت ، بەتایبەتی لەدوای ئـەوەی کە ئەو کێبڕکێیەی کە کرا بۆ میواندارێتی جامی ٢٠٠٦ بەشێوەیەکی دراماییانە دۆڕاندی کە ئەویش بەجیاوازی یەك دەنگ بوو .

وە حکومەت بۆ ئەم مەبەستە بودجەیەك بەبڕی ( ٢٤٣,٨ ) ملیۆن دۆلاری تەرخان کردبـوو بۆ پـەرەپێدان گەشـەپێکردنی یاریگاکـانی تۆپی پـێ لەحاڵـەتی بردنـەوەی کـارتی مـافی میواندارێتی کۆتاییەکانی جامی جیهامی .

وە ئەم پاڵەوانێتییە دەسکەوتێکی بەبڕی ( ١ ) ملیار دۆلاری دەسـت دەخسـت بـۆ باشـوری ئەفریقا ، سەرەڕای ڕەخساندنی سەدەها کار و وەزیفە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سەرەکی وڵات، کە تێکرایی بەتاڵـە دەگاتـە نزیکـەی ٣٠٪ لـە کـۆی سـەرژمێری دانیشـتوانی کـە دەگاتە ٤٤ ملیۆن سەرنشین . بـەڵام ئـەوەی کە لەوانـە بـوو ببێتـە هـۆی لاوازکردنـی چانسی باشووری ئـەفریقا لـە میواندارێتی جـامی جیهـانی ٢٠١٠ دا بریتـی بـوو لـە کێشـەی ئـەمنی ، وە ئـەوەش بزانـین کـە پێگـەی جوگرافـی



باشـووری ئـەفریقاش کۆسـپێکی تربـوو لەبـەردەمیدا چونکـە کێشـە دەخولقـاند لـە ئاسـت گواستنەوەی هەڵبژاردەکانی ئەوروپا و هاندارانیان لە ئەوروپاوە بۆ باشووری ئەفریقا .

لەکۆتایدا ئەوە ماوەتەو بڵێین کە لەم سەردەمەدا زۆرێك لەوڵاتان ئـاوا کێبڕکـێ دەکـەن بـۆ وەدەست هێنانی مافی میواندارێتی پاڵەوانێتییـە جۆربـەجۆرەکان بەتایبـەتی جـامی جیهـانی تۆپی پێ ، کە جگە لەچەند دەسکەوتێکی کەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەسکەوتێکی دارایی وئابووری زۆر یان دەست دەکەوێت ، وەك باسمان کرد بۆ جامی جیهانی ٢٠١٠ زانیمان نزیکەی پێنج وڵات داوایان پێشکەش کردبوو تـاکو ئـەو مافـە بۆخۆیـان وەدەست بخـەن ، ئـەوە بـوو لـە مانگی مایو / ئایار ی ٢٠٠٤دا ئەو کارتە لە ئەنجامدا و سەرەڕای وەك وتمان چەندین کۆسـپی ئەمنی و پێگەی جوگرافی بۆ باشووری ئەفریقا دەرچوو .

جا ئێمە لێرەدا مەبەستمان لەوە بوو کە ئەوەی زیـاتر وا لـەو وڵاتانـە دەکـات کـە بچنـە ئـەم مەیدانی کێبڕکێیەوە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ باری ئابووری و بوژاندنـەوەی ئـابووری وڵاتەکـەیان لەڕێگەی ئەو جۆرە پاڵەوانیەتیانەوە .

### سەرچاوەکان

ماڵپەڕی ئیسلام ئۆن لاین
ماڵپەڕی سپۆرت نیوز
ماڵپەڕی کەناڵی فۆکس نیوس
ماڵپەڕی کەناڵی ئەلجەزیرە





# چۆنیەتی سەرهەڵدانی ڕێبازی تەسەوف لە کوردستاندا



پرۆفیسۆر عزەدین مستەفا ڕەسول

سازدانی : جێگری سەرنووسەر . دەروێش عەبدولقادر

خوێنەرانی زێدە خۆشەویست وەک لای هەموان روون وئاشکرایە کە کورد هەر لەدێر زەمانەوە ناسراوە بە دڵ دەرون پاکی و میوان دۆست و هەڵکەوتنی چەندین کەڵە پیاو لە بوارە جیاجیاکاندا وە چەندین سیفەتی جوانی کۆمەڵایەتی وە کاتێکیش کە ئامێزی کرد بە ئیسلامدا ئەوەندەی تر بووە خاوەن سیفەتی جوانتر و زیاتر کەڵەپیاوی تیادا هەڵکەوتوە ، جا ئێمە لێرەدا باس لە یەکێ لەو بوارانە دەکەین کە کورد لەهەموو گەلەکانی تر تەنانەت لە عەربیش زیاتر تیادا قاڵبوتەوە و چەندین کەسایەتی و کەڵە پیاوی لەگشت بوارەکاندا پێگەیاندوە کە ئەویش ڕێبازی تەسەوفە ، جا ئێمەش وەک لاکردنەوەیەک لەم ڕێبازە کە پێم وایە نەمانتوانیوە هەقی خۆی پێبدەین بەڵام هیوادرین توانیبێتمان کەمێک زانیاریمان بەخشیبێتە ئێوەی زێدە خۆشەویست ، هەڵساین بە توێژینەوەیکی کورت و سەردانی چەند کەسایەتیەکی ناوداری گەلەکەمان کرد کە لەو بوارەدا زانیاریان هەیە و پرسیارێکمان ئاراستە کردن کە هەر بەڕێزەیان بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لەبەر دەستیاندا بوو زۆر بەوپەری سنگ فراوانیەوە وەڵامیان داینەوە .

*پرسیارەکەشمان ئەوەبوو کە ( سەروەت ) : ئایا ڕێبازی تەسەوف کەی و چۆن هاتە کوردستانەوە ؟و وە کاریگەری ئەو ڕێبازە چی بووە لەسەر هەریەک لە بوارەکانی کلتوری و فەرهەنگی و سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردەواری؟ .*

سەرتا ڕووی پرسیارمان کردە بەرێز " پرۆفیسۆر عزەدین موستەفا رەسول " و بەم شێوەیە وەڵامی داینەوە و بۆگۆڤارەکەمان دووا

گەلێك جار ئەم پرسیارەم لێکراوە کە تەریقەت یان تەسەوف کەی هاتۆتە کوردستانەوە ، لە گەلێك جاردا وەڵامی من هەر لەبەر رۆشنایی ئەوانەدا بووە کەنووسراون یان بیستوومن .

ئێستاش بەکورتی و بەپێی قەوارەی گۆڤارەکەتان ئەگەر هەندێك شت دووبارە بکەمەوە زیانی نیە و ئەگەر لێشی زیاد بکرێت ، ئەوا دەڵێن ( نوری عەلا نور ) .

تەسەوف لای من دووبەشە : تەسەوف بەبیر وتەسەوف بە کردار یان بە ( سلوك ) ، ئەگەر لەسەر باسی یەکەمیان بووەستین ، ئەوە دەبێ لەزۆر کۆنەوە دەست پێ بکەین و بچینەوە سەر ئاینەکانی پێش ئیسلام ، کە لەهەر یەکەیاندا جۆرێك لەبیر هەیە کە بدرێتە پاڵ تەسەوف یان سۆفینیزم ( Mystieim ) ، چ لە ئاینەکانی پێش ئیسلامدا تا ئیسلام هەندێ کەس بۆهەر مەبستێك بێت لە بیرێکی دوور لە ئایدیالیستی وەك ماکسیزمیشدا هەندێ بیر و لەخۆ بووردوویی مارکس و( بەتایبەتی ) ئەنگلز بەجۆرێك لە ( Mystieim ) دا دەنێن ، بیری سۆفینیزم لای هەر جۆرە سۆفیەك پێناسە ولایەنگری خۆی هەیە .

ئەگەرلەم لایەنە بگەڕێین لە بیری سۆفینیزم لە کوردستاندا ئەوا لە ئەدەبیاتی کوردیدا( یان شیعری کوردی ) دا ڕەگەزێ دەبینین کەپێش پەیدا بوونی سۆفیزم بەرەفتار ( یا بەسلوك ) لە کوردستاندا دیارە .








هەرچی ئەم چەشنە یا بەشەیە کە ( سلوك ) ، ئەوا هەر لە تەریقەتدا خۆی ..ـیتەوە ، ئێستا لە کوردستاندا دووتەریقەتی گەورە باون ( قادری و نەقشـەبەندی ) ..مگە هەندێ تەریقەتی تریش مووریدیان هەبێ ، بەلام بەجۆری بوونـی تەکیـەی زۆری ..ـدێیەکان و خانەقای نەقشبەندییەکان شوێنی خۆیان هەبێ ئاگادار نیم .

..ۆ ئەم دووتەریقەتەش ئەوە قادری هەر دەبێ لەزەمانی شێخ عەبدولقادری گـەیلانی ..٤٧ هـ - ٥٦١ هـ ) خۆیەو هاتۆتە کوردستان .

..ۆ لەدایك بوونی شێخ عەبدولقادر هەندێك دەڵێن لەگوندی ( نیف )یا( نـایف )ی ..ـرچەی گەیلان بووە وە هەندێکیش بەخەڵکی " گـەیلان غـەرب " ی دا دەدرێـن ،کە ..ـیستەش ناوچەیەکی کورد نشینە ، بەهەموو حاڵێك شێخ عەبدولقادر لەبـەغدا بـووە ..ـێخ و بنیـاد دانـەری تەریقـەتی قـادری ، کە بـەغدا ئەوکاتـەی ئـەو و هـەر لـە ..ـەزراندنییەوە کوردی زۆری تێدا بووە .

..ە ئیجازەنامەیەکی تەریقەت وبەخەلیفەی خۆکردنی کاك ئەحمەدی شـێخدا کـە بـۆ ..ـحی مەلا رەسولی دێلێژە نووسراوە ( کە باپیری منە ) و ئێستا لای مـن پـارێزراوە ، ..ـ ئەحمەد شەجەرەی تەریقەتی خۆی دەباتـەوە سـەر بـاوکی ( شـێخ مـارفی نـودێ و ..ـرش بۆسەر شـێخ عـەلی دوڵپـەموو ئـەویش بۆسـەر شـێخ ئیسـماعیلی ولیـانی ئیتر ..ـیتر عەرەبن وەك ( شێخ ئەحمەدی ئیحسائی ... هتد تا شێخ عەبدولقادر کوردیشی ..ـەکەوێ و هـەر لەسـەر پێڕەوی شێخانی تەریقـەت لـە شێخ عـەبدولقادرەوە بـەرز ..کرێتەوە تا پێغەمبەر ( ﷺ ) ، لەو بەینەشدا کەسی وەك ( شێخ عەلیی هـەکاری ..ـیە ، بەلام ئەوەی سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە کە کاك ئەحمەد ناوی خـۆی بـە ( سـەید ..حمد النودي البرزنجي القادري النقشبندي ) بردووە . بۆئەمە رەنگە رای تریش هـەبێ ..ـر ئەم ( شەجەرە ) یە لەکوردستاندا نییە ( مەبەستم بۆ قادری ) یە .

هەرچی نەقشبەندین ئەوە دیار وباوە کە هەر مەولانا خالید هێناویەتە کوردستانەوە ١٧٧٧ - ١٨٢٦ ز ) بەجۆرێکی بەربلاویش لە کوردستان و خاکی عەرەب و شـوێنی ..ـی داگستاندا بلاوی کردۆتەوە .

بێگومان بنەڕەتی تەریقەتەکە لە بوخارا وە لەسەر دەستی شاهی بوخاری یا بوخـارا ١٣١٧ - ١٣٨٩ هـ ) دا دامـەزراوە ، بـەلام درەنـگ وەك ( سـلووك ) گەیشـتۆتە ..ۆردستان .

باسی بوونی کۆن و تەنانەت ئێستاشم لەبارەی چەند تەریقەتی تـرەوە بیستووە وەك چەشتی ، شازلی - لەدیار بەکر - ) لەخۆوە نەهاتووە کە شێخ مەحمودی نەمر نـاوی ..ورر بەخشی ) ی کردووە بە تەخەلوسی خۆی لەشیعردا .

ئایا دەبێت ئەوان پێش شێخ ئیسماعیلی ولیانی تەریقـەتی ( نـوور بەخشـی ) یـان ..ەبوبێت ؟ رەنگە کە سانێك کە حەز بەم چەشنە لێکۆڵینەوانە بکەن بتوانـن بـەدووای ..ـە باسانەدا بگەڕێن .

وە سەبارەت بەوەی کە کاریگەری تەسـەوف چیبووە ئەوەیـە کـە کـاری تەسـەوف لەئـەدەبی کوردی ، وا ئەزانم کارێکی گەورەیـە و زۆریـش گەورویە ، ئێمە بابەتایەری هەمـەدانی (٩٣٥-١٠١٠ز)بەیەکـەم شـاعیری کـورد دادەنرێـت . بیری خواپەرستی سۆفیانە لەشیعرەکانیدا دیارە . بەلام سەر بەکام تەریقەت بووە .ئەوە باسێکی درێژو و قوڵی دەوێت .

پاش ئەو زوربـەی شـاعیرە گەورەکلاسیکی یـەکانی کـورد سـۆفی بـوون ، نەقشـەبەندی نـەهاتبووە کوردردسـتانەوە کەمـەلای جـەزیری (سـەدەی شـانزە هـەم بـۆ حـەڤدە ) مۆرکـی سۆفیزم و ئەو تەریقەتە بەشعریەوە دیارە .

هەرئەم چەشـنە دیمەنـە لەمـەم وزینـی ئەحمەدی خانیشدا دەبینینـەوە (١٦٥٠-١٧٠٧ ز) . شاعیرانی گەورەی وەك شێخ مارفی نۆدێ و مەولـــەوی و مـــەحوی هەرســـۆفی وســەربەتەریقەتیش بــوون . لــەناو شــێخانی تەریقەتیشدا زور رابەر دەبینین کەبیرو هەستی خۆیـاوە بەشـیعر دەربڕیـوە ( موحـی شـێخ عبدالقادر خۆی ، مـەولانا خـالید ، شێخانی تەوێڵە وبیارە ، شێخ عبدالکریمی قـادر کـەرەم (خادم) ......هتد .

تەسـەوف بەرهـەمی گـەورەی بەئـەدەب وشیعری کـوردی بەخشی. یەکـەم بەرهـەمی پەخشانی کوردی مەولانا خالیدی نوسـیویەتی و بەرهـەمێکی گـەورەورەنگینی پەخشـانی کوردیـش مەولوودنامـەی شـێخ حسـێنی قازی یە.




## دکتۆر عوسمان عەبدول بەرزنجی / سەرۆکی بەشی کوردی ـ زانکۆی سلێمانی

سۆفیگەرێتی ، بابەتێکی کۆنی ئاڵۆز و بەیەکدا چووە و سەرەتای پەیدابوونی لەسەر زەویدا دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی سەرەتاکانی ژیان ، بەتایبەتی بۆ ئەو سەردەمانەی کە ئایین هاتە ئاراوە و دیارە ئەمیش تێڕوانینێکی ئایینی بۆ جیهان هەیە و بنەرەتەکانیشی زیاتر لەسرووتە ئایینییەکانەوە هەڵهێنجراوە ، لەبوارە ئایینیە جیهانیەکاندا ووشەی سۆفی بۆ ئەو کەسانە بەکار هێنراوە کە بوونەتە موریدی ڕێبازی سۆفیگەرێتی .

دیارە ئەم ڕێبازە زیاتر لەئایینی ئیسلامدا برەوی پەیدا کردووە ، بەڵام پێشتر لەلای ئایینیەکان و ئایینە ئێرانیەکانی وەکو (( زەردەشتی و مانی و مەزدەکی )) و هەروەها لای ئاینی جولەکە و مەسیحیەکاندا هەبووە .

هەر لێرەوە ئەگەر بڵێین سەرەتای سۆفیگەرێتی لەناو کوردستاندا پێش هاتنی ئاینی ئیسلام و موسوڵمان بوونی کورد باو بووە ، بەڵام پاش موسوڵمان بوونی کورد ڕێبازی سۆفیگەرێتی لەڕوانگەی ئاینی ئیسلامەوە لەناو میللەتی کوردیشدا برەوی پەیدا کردووە وەك چۆن میللەتە موسوڵمانەکانی تریش ئەم ڕێبازەیان وەرگرتووە .

ڕێبازی سۆفی گەرێتی لەدوای موسوڵمان بوونی کورد و بڵاوبوونەوەی ڕێبازی سۆفی گەرێتی چەند بیر بۆ چوونێك هەیە ، لەوانە هەندێك لەشارەزایان لەو بوارەدا وای بۆ دەچن کە پاش ئەوەی بیری سۆفیگەرێتی بەکاریگەرێتی مەنسووری حەللاج لەکۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچیدا سەری هەڵدا و بەناو گەلانی موسوڵماناندا بڵاو بوەوە هەر بەو شێوەیە ئەو بیرە هاتوتە ناو کۆمەڵی کوردەوارییەوە و لەناو فەرهەنگ و کلتورەکەیدا ڕەنگی داوەتەوە باشترین بەڵگەش چوارینەکانی باباتاهیری هەمەدانی کەلە ( ٣٢٤ ك =٩٣٥ز ـــ ٤٠١ ك = ١٠١٠ز ) ژیاوە ، بەیەکەم ڕەنگدانەوەی بیری سۆفیگەرێتی ناودەبرێت لەفەرهەنگ وئەدەبیاتی کوردیدا کە بەشێوە زاری لوڕی نووسیونی .

باشتریش لەئەدەبیاتی ناوچەی هەوراماندا لەسەر دەستی ( مەلا پەرێشان ) کە لەنێوان سەدەی چواردە وپانزەی زاینیدا ژیاوە ، لەسەدەی حەڤدەهەمی زاینیشدا لەئەدەبیاتی کرمانجی سەرودا لای " مەلای جزیری " و دواتر لای " ئەحمەدی خانی ( ١٦١٥ ـــ ١٧٠٦ ز ) گەیشتە لوتکە ، ئەوانە بەگشتی دەتوانین بڵێین کاریگەری زانا و سۆفیە گەورەو ناودارەکانی ئیسلامیان لەسەر بووە هەر لەحەللاجەوە تا دەگاتە شەمسی تەورێزی و مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی و ... هتد

بەڵام لەخوارووی کوردستاندا و واتە لەشێوە زاری کرمانجی خواروو دا نابێ ڕۆڵی مەزنی " مەولانا خالد نەقشبەندی " ( ١٧٧٦ ـــ ١٨٢٦ ز ) لەیاد بکرێت ، کە دوای ئەوەی لەسەر داوای " شاعەبدوڵلای عەزیم ئابادی هیندی " کە لە ساڵی " ١٨٠٨ز " هاتوتە شاری سلێمانی و مەولاناخالدی بینیوە ، ئەویش یەکێك بووە لەموریدەکانی " شاعەبدوڵلای دیهلەوی " هەر بۆیە مەولانا بڕیار دەدات کە سەفەری هیندستان بکات و بچێتە خزمەت ئەو زاتە ولەوێ ئیجازە و ئیرشادی لێوەرگرتووە ودواتر لەساڵی " ١٨١١ ز " دا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و دەستی کردووە بەئیرشادی موسوڵمانان و ڕێبازی نەقشبەندی دامەزراندووە و لەهەمان کاتدا وەك زانایەکی گەورە بیری سۆفیگەرێتی ڕۆڵێکی مەزنی گێڕاوە لەناوچەکەدا بەگشتی وچەندەها زانا و شاعیری ناوداری کورد ڕێبازەکەیان پەسەند کردووە و بوونەتە موریدی ، لەناویاندا کەلە شاعیری سۆفیگەرێتی کورد " مەحوی " ( ١٨٣٢ ـــ ١٩٠٦ ز ) بەشاسواری ئەو بوارە دادەنرێت .



دکتۆر عوسمان عەبدول بەرزنجی

*دیارە ڕێبازی سۆفیگەرێتی خۆی لەخۆیدا کاریگەری هەبووە لەسەر کلتور وفەرهەنگی کوردی بەگشتی ، چونکە هەر لەڕێگەی ئەو ڕێبازەوە چەندەها ووشەی نوێ کەتایبەت بوویێت ، بەزاراوەکانی ئەو ڕێبازە لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا جێی خۆیان کردوتەوە .ئەمە جگە لەوەی کاریگەرێتی داب و نەریتەکانی سۆفیێتی لەسەر کەسایەتی کورد بەتایبەتی سۆفیەکان لەبواری کۆمەلایەتیدا زۆر بەئاشکرا ڕەنگی داوەتەوە و هەر لەو ڕوانگەیەوە ڕەنگدانەوەی زۆری هەبووە لەناو کۆمەڵگای کوردیدا .

لەبواری کۆمەلایەتی و نەتەوەیی‌دا ، سۆفیگەرەکان بەتایبەتی ئەوانەی هەستی نەتەوایەتیان لەناخدا بەهێز بووە بۆنموونە دامەزرێنەری ڕێبازەکە " مەولانا خالید " کە ویستوویەتی هەر لەڕێگەی ڕێبازەکەیەوە هەستی نەتەوایەتی خەڵکی کورد بجولێنێ و داکۆکی لەمافەکانی خۆیان بکەن ، بەڵام دیارە ئەوکارەی ئەو کەلەو سەردەمەدا دەسەلاتی تورکە عوسمانیەکان بەناوی ئیسلامەوە لەهەموو ولاتانی ئیسلامیدا بالا دەست بوون و کوردستانیش کۆیلەیەکی ئەو سیستمە شۆڤێنی و ڕەگەزپەرستیە بووە ، هەر بۆیە ناچار کراوە کە سلێمانی بەجێ بهێلێ و سەری خۆی هەلگرێت و ڕوو لەشام بکات ، لەوێ بەناسۆرەوە لەساڵی " ١٨٢٦ ز " سەری ناوەتەوە .

## مامۆستا کەیوان ئازاد ئەنوەر / توێژەرەوەی مێژوویی و مامۆستای زانکۆ



مامۆستا کەیوان ئازاد ئەنوەر

ــــەرەتاکانی دەرکــەوتنی ڕێبــازی تەســوف ـەکوردسـتاندا بوتاوەراسـتی دەسـەلاتی خەلافـەتی ـەاسـی دەگەڕێتـەوە ، بـۆ ئەوکاتـەی کە بـارودۆخی ـلافـەتی عەباسـی دووچـاری جۆرێـك لـە لاوازی ـیستمی دەسـەلات و بـەڕێوە بردنـی کاروبـاری ـوەتی خەلافەت بوو .

ـەونێوەندەدا کوردستان بەسەر سێهەرێمی بەڕێوە ـ ـەتی بـەناوی " ولایـەت " دابەشـکرابوو کـە ـیەتەکانی " جزیرە و هەرێمی چیا و ئازەربایجان و کوردستان " بوون .

ئەمە ولەلایەکی ترەوە خودی ئەوسێ ولایەتە جۆرێك لە دەسەلاتی ناوچەیی بـەخۆوە ـیی کەهەر ناوچەیەك میر نشـینێکی کـوردی فـەرمانڕەوایی تێدا دەکـرد ، ئەم بـارو ـۆخەش زەمینەی دەرکەوتنی جۆرێـك لـەڕێبازی ئـاینی ڕەخسـاند کە خـۆی لـەڕێبازی ـەسـوفدا بینیـەوە ، سـەرەتاش ڕێبازەکـەی ( شـێخ عـەبدولقادر گـەیلانی ) لەسـەدەی ـەهەمدا لەژێر ناوی ڕێبازی قادری بەکوردسـتان ئاشـنا بـوو ، دواتـر لـەقۆناغێکی ـەمەکتردا ڕێبازەکانی " قادیانی و نەقشبەندی " گەیشتنە کوردستان .

دەرکەوتنی ڕێبازی تەسەوف وەك ڕێبازێکی ئاینی سەربەخۆ لـەچوار چێـوەی یاسـاو ـەریعەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا وەك ڕێبازێکی نوێی کارا بەکوردستان و توێژەکان ـ کۆمەلگای کوردی ئاشنا بوو ، بەمەش کۆمـەلگای کوردەواری جۆرێك لەسەربەخۆیی ـبازی ئاینی جیاواز لەخەلافەتی عەباسی و ملکەچ بوون بۆ ئەو سیستمە ئیسـلامییە ـەغدادی پایتەخت بەخۆوە بینی .

ڕێبازی تەسەوف بە هەر دوولقەکەیـەوە ، قـادری ونەقشـی ، کەپێگەیـەکی فراوانـی ـەکۆمـەلگای کـوردەواری داگیر کرد کاریگـەری لەســەر ڕەوشـت و داب ونـەریت و ـەفیکری و کۆمەلایەتی کـوردەوە بەجێهێشـت . ئەمـەو لەلایـەکی تـرەوە کۆمـەلی ـوردەواری زۆر بــە ســنگ فراوانــی و تامــەزرۆوە باوەشــی بــۆ هــەردوو ڕێبازەکــە ـەدوو قۆناغی جیا جیا کردەوە ، هەربۆیە لەچەند کاتێکی جیاواز و بـە ماوەیـەکی دوور ـ ـرێژ رابەرایـەتی هـەردوو ڕێبازەکـە بـە کەسـایەتیە دیارەکـانی کۆمـەلی کـوردەواری ـپێدرا دیارە گەورەیی وفراوانـی هـەردوو ڕێبازەکـە جیـاوازی ئەرکـەکانیان وایکـردووە ـەرست وئارەزووەکانی زۆرترین توێژی کۆمـەلی کوردەواری لەخۆیان رازی بکەن .

ڕێبازی قادری بەهۆی مورێدەکانیانەوە کە دەروێشی پێدەوترا خـودا پەرستیەکەیان ـجۆرێك لەدەنگ بەرزی ئەنجام دەدا لەبەرامبەر مورێدەکانی ڕێبـازی نەقشـبەندی کە ـەسۆفی ناسران و خوا پەرستی و زکر کردنەکانیان بەجۆرێك لە بێدەنگی پێـوە بـوو ، ـدکتەری رازیکردنی زۆرترین توێژ وجێگرتنەوەیان بوو لە سەراپای کوردستاندا ، بۆیـە ـاریگـەری گـەورەیان لەسـەر زۆربـەی بــوارە ژیاریــەکانی کوردســتان دروســتکرد و ـەجێهێشت .

## دکتۆر صباح بەرزنجی / مامۆستای زانکۆ

نامەوێت لەسەر پێناسـەی تەسـەوف بـڕۆم چونکە لەم بارەوە سەرچاوەکان زۆریان نوسـیوە نەك تەنها لەئیسلام وجیهانی ئیسلامدا بەلکو لەهـەموو ئـاین و گۆشـەیەکی ئـەم جیهانـە دا تـەوژمی سـۆفی گـەری هـــەبوە و هەیـــە و دەشمێنێت ، چونکـە بونـی تەسـەوف بەسـتراوە بەناخی مرۆڤەوە کەمرۆڤ عاشقی (موتلـەق ) ەو ئەم عیشـقە یـە پـالی پێـوە دەنێت کەهـەر ئاین و بەرنامەیەکی هەبێت بەکاری بهێنێت بۆ گەیشتن بە مـەعشوقی خۆی و بـەزمانی جۆراو جۆر گوزارشتی لێ دەکات .

بۆیە لەکاتێکدا تۆماری مێژووی تەسـەوف دەخوێنینەوە چەندین ڕێچکە و ڕێباز و جۆرەها زمان و گوتار دەبینین کە هـەندێکیان پێکـەوە گونجـاون و هەندێکیشـیان پێکـەوە نـاکۆك و ناتەبان ، لەهـەمان کاتدا جۆرەها پۆلێن کـردن دەبینـین ، وەك تەسەوفیئیسـلامی ، هینـدی ، ئێرانی ، گنوسی تەنانـەت تەسـەوفی چینـی و یەهودی و مـەسیحیش .

ئەمــە وای کـردوە لێکۆلـەران چـەندین بیردۆزەو تیۆری لەسەر بنەماو ڕەگەزەکانی ئـەم بزافـە جیـهانی ومێژوویـی یـە بخەنـەڕوو ، کەتائێستاش نـەتوانراوە بدرێـت لەکاکلـەی مەبەست .

لەم ڕووەوە دەتوانین بلێـین هـەر تەسـەوفێك بۆ خۆی پێناس و چەمکێکی هەیەو لەسەر ئەو بنەمایـەش بڕیـاروو حوکمێکـی تایبـەت هەلدەگرێت . هەرچەندە هەمووشیان سـەرەنجام لـەچێر خێوەتێکـدا یـەك دەگرنـەوە و پێکـەوە جـەخت لەسـەر ئـەو ڕاسـتی یـە دەکـەن ، کەڕێگاکانی گەیشتن بەحەق ئەوەندە زۆر و فـرە چەشنن کەلەژمارە نایەن . بۆیە پێویستە بەجیا قسە لەسە ر تەسەوفی ئیسـلامی بکـەین واتـە ئـەو تەسـەوفەی کەلـەئامێزی کۆمـەلگای ئیسلامیدا سەری هەلداوە و قۆناغەکانی



گەشەکردن وبلاوبونەوەی برپوەو بەتێپەڕینی کات لق وپۆپ و مەشرەبی جیاوازی لیّ کەوتۆتەوە و بووەتە ئەمری واقیع وەنووکە بەشێکە لەبزافی ئیسلامەتی هەموو ولاتانی ئیسلام .

تەسەوف بۆخۆی تائەندازەیەکی زۆر لەگەلّ جەوهەری ئایندا دەگونجێت ، بەحکومی ئەوەی هەردووکیان لەفەلەکی بروا بەغەیب وتەجەرود لەماددە وگرنگییدان بە ڕۆح دا دەخولێنەوە ، واتە ئامانجیان هەریەکە ئەگەرچی ئامرازو ڕێگەشیان جیابێت ، ئاین بەو جیهانبینی وشەرائیع و شەعائیرەی کەهێناویەتی مەبەستیەتی ئەو ئامانج و مەبەستە بەرزو موتلەقەی عیرفان تاحەددی ئیمکان سادە وئاسان بکاتەوە بۆ ئەوەی مرۆڤ تێبگات و پێبگات ، هەرچیش عیرفانیشە دەیەوێت مرۆڤە ئایندارەکان لەئاستە نزمەکانی دینداری یەوە وردە وردە بەرزبکاتەوە بۆئەوی قوڵتر و شەفافتر ڕاستی یە گەورەکان ببینن . بەم پێیە تەسەوف لەو خاڵەوە دەست پیّ دەکات کەفیقە تیا دەوستێت ، واتە ئەگەر فیقە فێرکردنی سرووت و بەرنامەکانی پەرستن و موعامەلات بێت، ئەوا تەسەوف ڕێنمایی و گەیاندن و لەمحەکدانی ئەو فێرکردنە وبۆتەی ئەزموونی ئەو تەعلیمات ومەشقە نەزەری و عەمەلی یانەیە کە فیقهو پەروەردەی ئیسلامی بۆتاك و کۆمەلّ دەستنیشانی کردوون .

بۆیە ئەلّێم تائەندازەیەکی زۆر و نالّێم لەسەدا سەد چونکە مەرج نییە هەرچی بەناوی تەسەوفی ئیسلامی یەوە مەتروح بکرێت حەتمەن لەگەلّ بنەماکانی فیقهو ئەندێشەی ئیسلامیدا بگونجێت ، چونکە تەسەوف جاوبار توخم و ڕەگەزی نائیسلامی تێکەوتووە ولەهەندێك لەقوناغەکانی مێژوودا کەسانی بەناوموتەسەوویف بونەتە موشکیلە بۆ خودی بەرنامەوڕێبازەکە و بەکاریان هێناوە بۆ بەرژەوەندی دونیایی و تەم ومژیان بۆ کەسانی نەزان و سەتحی وبرِوبیانووشیان بۆ ناحەزان درووست کردووە !

سەرچاوە انی تەسەووفی ئیسلامی بەتەرتیب ئەمانەن :

١- ئەو ئایەت و فەرموودانەی تەئکید لەسەر تەقواو ئیخلاص و موحاسەبەی زات و خۆ ئامادەکرن بۆحساب و کیتاب و هیوابوون بەرِبزوان وترس لەسوونی عاقیبەت دەکەنەوە .

٢- ئەو سیەو شێوەژیانە سادە و دوور لەتەشریفات و کەمالیاتەی جیلی یەکەمی ئەصحاب وتابعین وموجتەهیدین واتە سەلەفی سالّحی لەسەر پەروەردەکراو لەئەنجامدا توانییان مێژووی مرۆڤایەتی و مەفهومی ژیان بگۆڕن ، کە بێگومان ژیانی ئەوان پڕبووە لەدەرس و ئەزموونی تەسەووفی ڕاستەقینە ، هەرچەندە ئەوان نەهاتوون ناووی تەسەووفی لێبنێن .

٣- ئەو هەلّوێست ئەزموونە دەلّەمەندانەی بۆمان ماوەتەوە لەکەسانی وەکوو حەسەنی بەصری و مەعروفی کەرخی و زەننونی میسری و جونەیدی بەغدادی و....هتد کەپێشەگی بزافی تەسەووفی ئیسلامیە و لەسەدا سەدیش پابەندبوون بەکیتاب و سوننە و ئیجماعی فوقەهائەوە .

٤- جگە لەزانستە کانی کەلام وئەخلاق وئەدەب کەلەدەقەکانی تەسەوفدا بەجوانی ڕەنگیان داوەتەوە .

٥- هەندێك لەفەلسەفەو ئەدەبیاتی عیرفانی گەلانی دیکەش ، کەزاناکانی تەسەووف بەدژ یا بەپێچەوانەی بنەماکانی ئیسلامیان نەزانیبێت بۆ زاخاوزدان و ڕاهێنانیموورید و سالیك بەپێویستیان دانابێت .

٦- ئیلهاماتی ڕاستەقینە و ئەزموونی کەسانی بەتەقواش بۆ خۆی دەبێتە بەشێك لە کەلتوری عیرفانی و گەنجینەی کەلەپووری ئەم بزاڤە پیّ دەولّەمەند دەبێت .

کەدێینە سەر کاریگەری تەسەووف بەمانا ئیسلامی و ڕەسەنەکەی پێویستە ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیە بکەین ، کە کاریگەری تەسەووف واتە کاریگەری ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەسەر یەکە یەکەی خەلّك و دواتر نەقشی ئەم ئاینە لەدروستکردنی کۆمەلگەیەکی ڕاست ودرووست وساغ و بەختەوەر ، کەبێگومان لەهەموو ڕوالّەتەکانی سیاسەت وئابوری کۆمەلاّیەتی فیکرو ڕەوشتدا بەرجەستە دەبێت . چونکە ئەو مرۆڤەی لەم مەدرەسەی عیرفاندا گۆش دەکرێت و فێری دینداری دەبێت مرۆڤێکی ساغ و دلّسۆز و کارایە و ئیجابیانە لەگەلّ غەیری خۆی مامەلّە دەکات و مەبستیەتی لەهەمووکار و چالاکی یەکدا حەق لەخۆی ڕازی بکات وڕەزامەندی مەخلوقیشی لەڕەزامەندی حەقدا دەوێت ، بۆیە هەرگیز کەسێکی ڕیاباز و مونافیق و موتەمەللیق وهەلپەرست نابێت و مەوقیعی خۆی بۆخزمەتی خۆی تەرخان ناکات بەلکو بەپێچەوانەوە خۆی و مەوقیعەکەشی و پلە وپایەکەشی دەخاتە خزمەتی خەلقی خوا . کەئەم نموونە جوانانەش لەمێژووی دیندارانی موتەسەوویفی ڕاستەقینە دا زۆرن و کۆمەلگاش باش دەیانناسن ، خۆ ئەگەر کەسانێکیش هەبن بەناوی تەسەووفەوە خەریکی سوالّ و سەدەقە وفێلّ وفریودانی خەلّك بن ئەوە تایبەت نی یە بەبزاڤی تەسەووفەوە ، لەهەموو بزاڤ ولەناو هەموو چین و توێژێکدا ئەم جۆرە کەسانە هەن کەڕۆلّی تەشویش دەبینن لەسەر هۆشیاری خەلّك ، بەلاّم ئەم تەشویشە تەنها تائەو کاتە بڕدەکات کەئێمە سەتحی لە بابەتی‌کان بکۆلّینەوە ، ئەدگینا سەرنجی وردولێکۆلّینەوەی زانستی کافیە بۆ ئەوە سەرمان لیّ تێك نەچێت و هەموشتێك نرخ و بەهای حەقیقی خۆی بدەینیّ . هەمو کەسێکی ژیر و وریاش دەزانێت کۆمەلگای ئەمڕۆ چ جۆرە کەسانێکی پێویستە بۆ ئەوەی کاردکان و ئەرکەکان بەجوانی و بەبیّ کەم و کووڕیی بچن بەڕێوە و مافی کەسیش پێشێل نەکرێت .



دکتۆر صەباح بەرزنجی




# یەکەم پێشانگای تەخریمی ( دیدارێک لەگەڵ مێژوودا )

سازدانی پەیوەندی : مەروان

کورد خاوەنی مێژوویەکی پڕ سەروەری و سەدان سەرکردەی بەتوانایە ، جا کاتێک باس لەمێژووی هەر گەلێک دەکرێت دیارە ئەو گەلە لەمێژووی رابردوویدا دەیان سەرکەوتن ر نشوستی و ماڵوێرانی و خیانەت و چەندین سەرکردەی شۆڕشگێر و ... هتد دەبنێت بەخۆیەوە .

( باپێکەوە لە روخسارەکانی مێژوو بڕوانین تاسیماکانی سبەینێ جوانتر ببینین ) ئەمە مانشێتی یەکەمین پێشانگای تەخریمی بوو سەبارەت بەمێژوو کە دوو برا لە دوچینی جیاوازی کۆمەڵگادا پێی هەڵساون کەئەوانیش هەردوو برای ڕۆژنامە نووس ئاسۆ شێخ کەمال و هونەرمەندی شێوەکار بێدار عوبێد بەرزنجی بوون بەناوی ( دیدارێك لەگەڵ مێژوو ) دا .

ئەم پێشانگایە گرێدانەوەیەکی هەمەلایەنەی مێژووی کوردە لە بزربوونەوەی سنورە دەستکردەکانی نێوانمان ، ئاشنایانی هونەر و مێژوو

دۆستان لەبەرواری ( ١٨ –٨ – ٢٠٠٤ ) دا لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی لە ژێر چاودێری بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری ( مامۆستا فەتاح زاخۆیی ) دا یەکەم پێشانگای تەخریمی لەکوردستاندا کرایەوە کە هی هەردوو بەڕێزان ڕۆژنامە نووس " ئاسۆ شێخ کەمال " و هونەرمەند " بێدار عوبێد بەرزنجی " بوو ، جا هەم وەك گۆڤاری سرووت و هەم وەك هاوڕێی هەر دووبەڕێزان بەفەخرەوە ئامادەیمان هەبوو لە و پێشانگایەدا بۆیە توانیمان چەند دیدارێکی کورت سازبدەین لەگەڵ لە هەندێ لە ئامادەبووانی ئەو پێشانگە مێژوویییەدا وا دەیخەینە بە دەستی ئێوەی بەڕێز .



*سرووت* : سەرەتا ڕوومان کردە بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری مامۆستا فەتاح زاخۆیی وە پرسیارمان لێکرد کە ئایا مامۆستا چۆن ئەم پێشانگایە هەڵدەسەنگێنێ و رای خۆیمان بۆ دەر بڕێت ؟

* جارێ ئەوە بۆکێیە ڕای خۆم دەربڕم ؟ بۆ گۆڤاری " *سرووت* "

بەڵێ "*گۆڤاری سرووت*" باشە دەیبینم و دەیخوێنمەوە گۆڤارێکی باشە و سەرکەوتووبن ، بەراستی پێشانگایەکی زۆر جوانە مرۆڤ بەدیتنی ئەم پێشانگایە گەشتێك بەناو مێژوویەکی دوور و نزیك دەکات ، نەك تەنها مێژووی سیاسی بەڵکو مێژووی ئەدەبی و روناکبیریمان .

وەلەم پێشاناگایەدا بۆ ئێمە روون دەبێتەوە کە ئەم ئازادیەی ئەمڕۆ هی ئەمڕۆتییە بەڵکو بەرهەمی خەبات و تێکۆشان وماندووبوون و خوێن ڕشتنی دەیان ساڵی ئەوکەسایەتیانەیە ، ئەمڕۆ کە تابلۆکانمان بینی بەشێکی گرنگی سەرکردەکانی ئەو خەبات و تێکۆشانەیە وقوربانییەکی زۆریان داوە ، ئەمە یادکردنەوەیەکی گرنگی مێژووی خۆمانە بۆ نەوەی نوێ ، ئەم جۆرە پێشانگایە کاریگەرییان زۆرە بەڵام بۆ ئەوەی باشتر سوودی هەبوایە پێم خۆش بوو ئەمانە گەر بەکورتیش بوایە ژیاننامەیان لە تەنیشت وێنەکانیانەوە بنوسرایەتەوە بۆ ئەوەی ئەوانەی نەیانناسن ، بۆ ئەوەی زۆر باشتر سودیان لێ بکەین. وەعدێکیشم پێدان کە ئەم پێشانگایە بکەینە پێشانگایەکی بەردەوام لەیەکێ لە هۆڵەکانی کتێبخانەی گشتی بۆ ئەوەی خوێنەری کوردی ئاشنا بێت بەبەشێك لەمێژووی خۆی و دووبارە دەست خۆشی ئەم کارە مەزنەیان لێ دەکەمەوە سوپاس بۆ گۆڤاری "*سرووت*" بۆ ئەم ئەرکەتان ئامادە بوون لەم پێشانگایەدا .

> گرێدانەوەیەکی هەمەلایەنەی مێژووی کوردە
> لە بزربوونەوەی سنورە دەستکردەکانی نێوانمان




*سروەت* : بەرێز مامۆستا جەمیل بەڕێوەبەری کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی ، بەڕێزت هەڵسەنگاندنت بۆ ئەم پێشانگایە چۆنە ؟

* سەرەتا سوپاسی ئێوەی بەڕێز دەکەم ، پێشەکی دەست خۆشی دەکەین لەو کەسانەی کە بەشدارییان کردووە لەم پێشانگاو لەم کەلەپووری کوردایەتی یەدا وە ئەم ئاسارە گەورەیەیان زیندو کردۆتەوە کارێکی هونەری زۆر جوانە بەتایبەتی بۆ رازاندنەوەی کتێبخانە و وە وەك فەخر وشانازییەکیش بۆ کتێبخانە یە جگە لەوەش بەراستی مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمەکانی پێشوو هەروەها ئەو کەڵە پیاوە مەزنانەی کە لەم کارە هونەرییەدا خراونەتە پێش چاو و دەیانخاتەوە پێش چاوی کوردان و بەراستی هەر ئەوەندە دەڵێم کە شتێکی زۆ دانسقە ونایاب و جوانە ، دووبارە سوپاس بۆ ئێوەش .

*سروەت* : بەرێز دکتۆر فایەق موحەمەد گوڵپی سەرۆکی پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان ئەم کاتەت باش و هەڵسەنگاندنی بەڕێزتان بۆ ئەم پێشاناگیە چی‌یە ؟

* سوپاسی گۆڤاری " *سروەت* " دەکەم بۆ ئەم ئامادە بوونەی و ئەم دیمانەیەی ، من سەرەتا پیرۆزبایی لەهەردووبرا دەکەم برای نووسەر کاك ئاسۆ وە برای هونەرمەند کاك بێدار ، ئەوەی من بینیم یەکەم جارە دووکەس نووسەرێك و هونەرمەندێك هەڵدستن بەکارێکی ئاوا .

بێگومان ئەوە کارێکی پۆزەتیڤە ، کارێکی باشە وە لەلایەکی ترەوە یەکێتی نێوان توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵگە دەردەخات ، هیوادارم ئەو توێژانەی کە کاری هاوبەشیان هەیە نموونەیان زیاد بێت بەو شێوەیە پێکەوە ئەنجامی بدەن چونکە لە حاڵەتێکی وادا کارەکە ئەتوانم بڵێم زیاتر موتەکامل دەبێت وەك لەوەی یەکێکیان پێی هەڵسێ ئەمە لەلایەك لەلایەکی‌ترەوە ئێمە وەکو گەلی کورد بەتایبەتی لەباشووری کوردستاندا لە بواری رۆشنبیری و نەتەوایەتی‌یەوە گەلێك لاوازیمان هەیە ، یەك لەوانە هۆشیاری نەتەوەیی زۆر لاوازە لای ئێمە ئەم پێشانگا مێژوویی‌یە تێکۆشانی کەڵە پیاوەکانی کورد دەهێننەوە بیر کە هەریەك لەلای خۆیانەوە خەباتێکی ئەنجام داوە لە پێناو ئازادی و رزگاری نەتەوەکەیاندا ، ئەمانە کە ئەمەیان هێناوەتەوە ئەبێ ئێمە یادیان بکەینەوە بەرهەمەکانیان بخوێنینەوە ئەبینین کەمێژوویەکمان هەیە ، ئەمە وامان لێ دەکات کە هۆشیاری نەتەوەیی خۆمان پێش بخەین لەلایەکی ترەوە ئەم برادەرانە کارێکی وایان کردوە کە لەپارچەکانی کوردستانەوە باڵێین نوێنەری هەموو پارچەکانی تێدایە ئەمەش وامان لێ دەکات کە یەکێتی نەتەوەیی لەناوکوردا بەهێزبێت ئەم دووخاڵە هەم بەهێزکردنی هۆشیاری نەتەوەیی و هەم قوڵکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی و پێشخستنی یەکێتی نەتەوەیی لەم رۆژانەدا بۆ گەلی کورد زۆر گرنگن بەتایبەتی لەم سەردەمەدا کەئەم گۆڕانکاریانە لەعێراق و ناوچەکەدا هاتونەتە پێشەوە .

ئێمە لەڕێگەی بەهێزکردنی هۆشیاری نەتەوەیی و یەکێتی نەتەوەیی ئەتوانین کۆمەڵێك گیر وگرفتە سیاسی و نەتەوایەتیەکانمان چارە سەر بکەین لە بەر ئەوە ئەم بەڕێزانە هەنگاوێکیان ناوە بەرەو پێشخستن و گەشەپێدانی یەکێتی نەتەوەیی .

خاڵێکی تر کەمن بەلامەوە گرنگە ئەوەیە هونەر جوانی‌یە هونەر لەزەت وەرگرتنە لە ژیان هونەر بەهێزکردنی پرۆسە جیاجیاکانی ژیانە لەهەرەیك لە بوارەکانی سیاسی و کۆمەلایەتی ئابووری .

منم لێرە لەتێبینی یەکانی خۆمدا شتێکم نووسیوە کە هی کەسایەتی‌یەکی ناسراوە کە ئەویش بەرێز ( عەبدوللا ئۆچ ئالان )ە کە ئەڵێ : ئەگەر هونەر تێکەڵ بکەین لەگەڵ سیاسەتدا وەك ئەوە وایە باڵ بۆ سیاسەت دروست بکەین ، سیاسەت بەبێ هونەر وەك ئەوە وایە باڵی نەبێت سیاسەت بەبێ هونەر وەك ئەوە وایە مرۆڤێك تەنها بەپێ بڕوات بەڕێوە و بەپێ ئەنجامەکەی پی‌بگەیەنێ ، بەلام ئەگەر سیاسەت بە هونەر تەعبیر کرا ئەوکاتە وەکو ئەوە وایە مرۆڤەکان بەباڵ بفڕێ زوودەگاتە ئامانجەکەی خۆی .

واتە ئەگەر ئێمە سیاسەت بکەین بەبێ هونەر درەنگ دەگەین بەئامانجەکانی خۆمان بەلام ئەگەر سیاسەت لەگەڵ هونەرا هونەرمان ئامێز تێکەلاوی سیاسەت کرد یان بە هونەر تەعبیرمان لە کێشە سیاسی و نەتەوەیی‌یەکانمان کرد ئەو کاتە زوو پێش دەکەوین . وە ك ئەوە وایە مرۆڤێك باڵ بۆ خۆی دروست بکات و بێ گوومان مەسەفە بڕین درەنگتر دەبڕدرێت بەپێ وەك لەوەی بەفڕین ، لەبەر ئەوە وولاتێ ئەو لایەنە سیاسی‌یەی ئەو




ئەو کۆمەلگایەی گرنگی بەهونەر لە بوارە جیاکانی ژیاندا دەکرێت ، بدات ئەو کۆمەلگەیە زو پێش دەکەوێت .

بۆیە من دەستخۆشی لەم بەرێزانە دەکەم و هیوادارم نموونەیان زۆربن وە هونەرمەندان لەرووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە پێش بکەون بۆ ئەوەی بەرێگەی هونەر تەعبیر لەپێویستیەکانمان و لەگیرمە و کێشەکانمان لە شێوازی چارەسەرەکانماندا بکات .

سروەت : بەرێز لیوا بێستون ئەحمەد نەجیب ( سەرۆکی دادگای سەربازی هەمیشەیی ) ، رای بەرێزتان چۆنە بۆ ئەم پێشانگایە ؟

*سەرەتا سوپاسی گۆڤارەکەتان دەکەم و گۆڤارێکی بەسوودە و باشە و سەرکەوتووبن ، پێشەکی دەست خۆشی لەهەردوو برای


لیوا بێستون ئەحمەد نەجیب

بەرێز کاک ئاسۆ و کاک بێدار دەکەم بۆ ئەم بەرهەمە بەسوودەیان ، لەراستیدا پێشاناگایەکی زۆر زۆر رێک وپێکە وە سەرهەلدانەوەیەکی مێژووی کوردە بەتایبەتی لە سەدەکانی نۆزدە وبیست و بیست ویەک کە لەم پێشانگایەوە بەیانی دەکات لە رێگەی ئەو کەسایەتییانەوە کە خراونەتە روو لەم پێشانگایەدا کە مێژوویەکی تەواومان هەبووە لەبواری سیاسی و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و ... هتد .

ئەم پیاوە بەرێزانەی کە وێنەکانیان نمایش کراوە هەریەکە لەکات و زەمەنی خۆیدا دەورێکی بالایان هەبووە ئەمەش بێگومان بەلگەیەکن بۆ ئەوە ی کە گەلی کورد خاوەنی مێژوویەکی تەواوی هونەری و سیاسی و کۆمەلایەتی و نیشتمانیە .

سروەت : کاک لیوا بێستون لە رێی بینینی پێشانگاکەوە چیتان بەدی کردوە و چۆن هەلی دەسەنگێنن ؟

* حەقیقەت ئەم بەرێزانە کە هەستاون بەم کارە گەورەیە و کە وەك ئاماژەی پێدراوە لە سێ شاری گەورەی کوردستاندا نمایش

خەلکێک دێن سەیری ئەم سەرکردە و ناودرانەی خۆیان دەکەن جا چ لە ناحیەی سیاسی و هونەری وکۆمەلایەتی دا بێت ئەوکاتە ئەو خەلکە هۆش و بیریان دەگێرنەوە بۆ ئەو ساتە وەختانەی کە ئەوانە لە ژیاندا بوون چ خزمەتێکیان پێشکەش کردووە بەگەلەکەیان ، مێژوویەکی دێرین ومێژوویەکی پاك و رێك وپێك ئەم دووبرایە گەورەترین ئیشی هەم هونەری هەم سیاسی هەم مێژوویی و نەتەوەییان بە ئەنجام گەیاندووە ، وە پشت بەخواش ئەم کارە جوانە دەمێنێتەوە لەهەولێ ومۆزەخانەکاندا وە سەرکردە و ناوداری تریش دەچێتە رێزی ئەوانەوە و مێژووە کەمان نەبراوە دەبێت ، بەلام ئومێدەوارم کە هەولێ بدەن گەر بەکورتیش بووە ژیاننامەیان لە پالێ وێنەکانیانەوە بە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی بنووسنەوە تاکو هەر کەسێکی غەیرە کورد هات بزانی کە ئەمانە کێن ، دووبارە زۆر دەست خۆشیان لێ دەکەم نموونەیان زیاد بێت وە سوپاس بۆ ئێوەش کە ئامادەی ئەم جۆرە پێشانگایانە دەبن .

سروەت : بەرێز مامی کوردە نووسەر لە رۆژنامەی( رۆژی ولات )

بەرێزتان چی دەبینن لەم پێشاناگایەدا ؟



* سەرەتا سوپاسی گۆڤاری سروەت دەکەم بۆ ئەم دیدارەیان ، دەربارەی پێشانگاکەی کاك بێدارو کاك ئاسۆ ..بێگومان دوژمنان و داگیرکەران بەدرێژای مێژوو لەهەولی لێك ترازان و شێواندنی سیمای نەتەوایەتیماندا ، توانیویانە لێ دانێکی کوشندەمان لێ بدەن وا حەز لەخۆمان ناکەین ، هەردەم خۆمان بەکەم زانیوە دیارە دوژمنان بەسالان ئیشیان بۆ ئەوە کردووە کەرەوشی کۆمەلایەتی و کەسایەتی ئێمە بگەیەننە ئەو ئاستەی کەبۆ خۆمان نکولی لەهەرشتێکی خۆمان بکەین ، هەستی نەتەوایەتیمان تارادەی دوایی لاوازبکەن و کلتوورو مێژووی خۆیان بکەنەواقعێك و لەناویدا بمان توێننەوە . دیارە هەرگەل و نەتەوەیەك خاوەن مێژوو چەندەها کەسایەتی دیارو ناوداری خۆیەتی ، ئێمەی کوردیش هەروەها بەلام بەهۆی سروشتی داگیرکاری و ئەو نەهامەتیانەی کەدەرهەقمان کراوە ، کەتووشی پەرش و بلاووی بووین ئەوەتا تەنها بەناو زۆر کەسایەتی ناوداری خۆمانمان بیستوە، بەسیما نایان ناسین .

هەربۆیە کۆکردنەوەو لێك گرێدانەوەی مێژووی پەرش و بلاوی گەلەکەمان نەك خزمەتێکە بەلکو ئەرکی سەرشانی هەتاکێك و توانا کارێکی نەتەوەکەمانە، هەرکەسێك بەپێی توانای خۆی کاری تێدا بکات .



ئەتوانین بەگشتی بلێین لەسیمای ئەو کەسایەتیانەی بەپێی ئاستی هۆشیاری و توانای خۆیان دڵسۆزی گەل ونەتەوەکەمان بوون ، بەلام لەسەر وەخت و دەورانی خۆیاندا نەمان توانیوە بیان پارێزین وەقەدریان بگرین ، هەتا کۆچی دواییان نەکردو کەس لەخەمیاندا نەبووە، بەلکو ئەوانە بەگشتی فەرامۆشکراوون ، تائەو ڕادەیەی لەفەرامۆش کردنی ئەواندا نەتەوەکەمان خۆی فەرامۆش و لەبیر کردووە ، مێژوومان بەباشی ناناسین ، لایەنی دووژمن کەهەردەم لایەنی سەرکەوتووبووە ئەومێژووی لەبەرژەوەندی خۆی دانوسیوەتەوە، هەربۆیە زۆر لایەنی مێژوویی نەتەوەکەمان بەشاراوەیی ماوەتەوە کەدەکرێت ئەم بیرۆکەیە بەهەند وەربگیرێت و پەرە بەزۆر بواری ئەدەبی و هونەری بدرێت لەپێناو ساغ کردنەوەی مێژووی نەتەوەکەما دا .

لایەنێکی تری سەرکەوتووی ئەم پرۆژەیە لەوەدایە کەبوێرانە و چاونەترسانە توانیویانە لێکدا نێکی کوشندە لەعەقلیەتی پارتایەتی کلاسیك بدەن ، کەئەو جۆرە تەنزە سیاسەتەش خۆی لەخۆیدا لەسەر بنەمای یەکتر قبوڵ نەکردن ڕێی کردووە واتە سەرکردایەتی سیاسی کوردیش بەبارتەقای دووژمنان لێ دانی کوشندەیان لەنەتەوەکەمان داوە .

بەلام کاکە بێدار وکاکە ئاسۆ ژیرانەتر و ئەدەبیانەتر گەرەکیانە لەم پێشانگایە دا پێمان بلێین کەئێمەی کورد خاوەنی ئائەو مێژووەین ، فەرموون باهەموومان بەگیانێکی لێپرسراویەوە باوەشی بۆبکەینەوە ، لایەنەجوانەکانی بکەینە سەرمەشقی ژیانی ئایندەمان و لایەنی ناشرینەکانیشی بکەینە پەندو و لە تەرزی نوێی خەباتماندا چیتر دووبارەی نەکەینەوە ، بەرپرسیارێتی مێژوو بخەینە ئەستۆی خۆمان ، واتە هەرکەس وابزانێ بۆ مێژوو ژیاوە هەربۆئەویش بژی .

لەم پێشانگایەدا وێنەی بەڕێزان (مەلامستەفای بارزانی وئیبراهیم ئەحمەد ) یان لەتەك یەکەوە هەڵ واسیوە، لەبەرامبەریشیاندا وێنەی شەهیدانی سمبولی ئازادی ( مەزلوم دۆغان و زەکیە ئەلکان ) ڕاگرتووە ، ئەوەخۆی لەخۆیدا هێڵی هەرە ڕاستی ئەم قۆناغەیە ، ئەمانە هەمویان بەیەکەوە جوانن !!

هەموویان مولکی نەتەوەکەمانن ! تەواو کەری یەکترین چیتر دەبێ سەرکردایەتی سیاسی کورد بەو مەنتیقە بیر بکاتەوە ، یەکتری نکوڵی نەکەن ، چونکە گەر ئەمڕۆ بەزیندووی یەکتری نکوڵی دەکەن ، ئەوا لە سبەینێدادەیان(ئاسۆ و بێداری ) ترمەردەیان هێننە لای یی‌کتری ، جابۆیە هەتا خۆیان لەژیاندان باهێندەی لێپرسراوێتی خۆیان نرخ بدەنە خۆیان و دۆزی ڕەوای گەلەکەیان .

سەروەت : لەکۆتایدا بە پێویستمان زانی کە بچنە لای هەردوو بەهرەمەندان و بەڕێزان کاکە ئاسۆ و کاکە بێدار تاوەکو لە نزیکەوە و لە دەمی خۆیانەوە هەنگاوەکانی ئامادەکاریان و نمایشکردنی ئەم پێشانگایە ببیستین و ئاستەنگ هاتوتە پێشیان گەر هەبووە چۆن بووە ؟ و چۆن بیرۆکەی وایان بەبیردا هاتووە و ئومێدو هیوایان چیە ؟

سەروەت : سەرەتا ڕوومان کردە برای هونەمەند کاکە بێدار عوبێد بەرزنجی و وتمان چۆن ئەم بیرۆکەیە هات بە مێشکتا ؟

* سەرەتا ئەمەوێت بلێم خۆئامادەکردنێکم هەبوو بەلام پێویستم بە سەرچاوەیەکی زۆر هەبوو تاکو ئەو پرۆژەیە بکەمە عەمەلی ئەویش لە ڕێگەی کاك ئاسۆ وە وەك ڕۆژنامە نووسێك بۆ ئەوەی ئەو سەرچاوانەم دەستگیر بکات کە بتوانم کارەکە بکەم بە پرۆژەیەك ، ئەوە بوو کاك ئاسۆش ئامادەیی خۆی دەربڕی و توانی لەرێی خۆی وچەند دۆست و هاوڕێیەکیەوە کەسایەتیەکان و زایاری دەربارەیان و وێنەکانیان دەستەبەر بکات منیش وەك شێوەکارێك وپەیکەر تاشێك توانیم کارەکە گەر هەقی خۆیم نەدابێتێ ئەوا توانیومە شتێکی بۆ بکەم کە جێی دڵی خەلکی بێت

سەروەت : سەبارەت بەوەی کە ئایا ئەم پێشانگایە مۆرکێکی سەربەخۆیی هەیە یان سیاسی ولایەنداری ؟

* نەخێر دڵنیا بە کە بەهەموو شێوەیەك سەربەخۆیە و بەهیچ جۆرێك پەیوەست نییە بەبیرۆکەیەکی حیزبایەتیەوە و وە وابزانم لەدروستکردنی تابلۆکان دیار وڕوونە کە کەسایەتی و ناودار وسەرکردەی هەر چوار پارچەکەی کوردستانی تێدایە کە ڕاستی ئەوە دەسەلێنێ کە پێشانگایەکی سەربەخۆیە ولایەندار نییە ، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەسایەتیەك تیایدا زەق نەکراوەتەوە .






سرووت: ئایا هاوکاری لایەنە فەرهەنگی و رۆشنبیری و سیاسییەکان چ ئەندازەیەك بووە لەگەڵتاندا و ئایا لەو هاوکاریانە رازین ؟

* وەڵامی بەپێی پێویست ناهاتونەتە پێشەوە بەڵام ئەوەی کە جێگەی ئاماژە پێکردن وسوپاس بێت و شایەنی ئەوە بێت کە ناوی بهێنین بەرێز وەزیری رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان (سلێمانی ) مامۆستا فەتاح زاخۆیی و یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان و وە پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان کە هاوکاری خۆیانیان پێش کەش کردووین بەپێی توانای خۆیان وە ئەوەشمان با لە یاد نەچێت کە "گۆڤاری سرووت " زۆر هاوکاریان کردین هەر لە دیزانیی پۆستەر ودەلیلەکان و داوەتنامە و پێداویستی کۆمپیوتەری کە بەراستی زۆر ماندووبوون لەگەڵماندا و تەنانەت پێم وایە رادەی دەرچوونی ژمارەی نوێی گۆڤارەکەشیان زۆر زیا دواکەوت و ئەتوانم بڵێم کە بەراستی شایستەی ئەوپەڕی رێزن و وە لە سەرەتای کردنەوەی پێشاناگاکەشەوە ئامادەیەکی پۆزەتیڤانەیان هەبووە هەر سەرکەوتووبن .

سرووت: وەك پێشتر ئاماژەتان داوە کە بەئومێدن ئەم پێشانگایە بەرنە کەرکوك و هەولێریش بەڵام لە سەر پۆستەرەکەدا دەبینین کە رادەی نمایشکردنی شاری هەولێر دیاری نەکراوە ، ئەمە هۆکەی دەگێرێتەوە بۆ چی ؟

* هەقیقەت ئەتوانم بڵێم هەندێ شوێن ئەم کارەیان زۆر بەلاوە سەیرە چونکە پێشتر کاری لەو شێوەیەیان نەبینیوە و نازانن چوتە چونکە کسانێك هەن بە مەیلی حیزبایەتی تەگەرە دەخەنە رێی پێشاناگاکە ، هەندێ دیاریکراومان بۆ دادەنێن تاکو بتوانین لە هەولێریش نمایشی بکەین بەڵام وەك لەسەرتاوە وتم پێشانگاکەمان سەربەخۆیە ونەچوینەتە ژێر مەرج و بڕیاری سەپێنراوی هیچ لایەنێك لەگەڵ رێزماندا ، بەڵام لەدوایشدا تا رادەیەك پاشگەز بونەوە لەو هەندێ تەگەرانە بەڵام ئیتر ناقارەکەی وا کەوتەوە کە پێشانگاکە نەبەینە هەولێر جا ئیتر نازانم لە ئایندەدا دەیبەین یان نەو ئەوەجێ دێڵین بۆ رۆژ وکاتی خۆی.

سرووت: کاك بێدار بێ موجامەلە هەڵسەنگاندنی خۆت بۆ ئەم کارە چییە ؟

* بە تەئکید ئەتوانم بڵێم ماندووبووین وە لەکۆتایدا دووبارە سوپاس بۆ ماندووبوونی ئێوەش زۆر سوپاس .

سرووت: بەرێز کاك ئاسۆ بیەوکەی ئەم پێشانگابە چۆن هاتە بیرتان وبەکورتی باسی بکەی ؟

* جارێ پێش هەمووشتێ سوپاستان دەکەم هەڵبەتە کاك بێدار یەکێکە لە شێوەکارە باشەکان وە دەستی تەخریمی زۆر جوانە کە کاك بێدارم بینی هەندێ تابلۆی زۆر جوانی کردبوو منیش بەراستی ئەوە سەرنجی راکێشا بووم ئەوە بوو پێم ووت ئێمە دەتوانین ئەم کارەی تۆ سوودی لێ وەربگرین و شتی جوانتر و گەورەتری پێ بکەین ، وە خۆشی ووتی منیش هە ئەوە م لە خەیاڵدا بووە .

پاشان هاتین وکسایەتیەکمان دانا و دروستی کردەوە زۆ بەجوانی و پاشان وردە وردە سەرتایەکمان دروست کرد هەتا گەیشتینە ئەوەی کە ئەو بیەوکەیە بکەین بە پێشانگایەك و پێشانگاکەش بەو شێوەیە بوو کە بینیتان .

سرووت : هەڵبژاردنی کسایەتیەکان عەشوائی بوو یان بەرنامە بۆ دارێژی بووە وە مەبەستان لەو هەڵبژاردنە دەکرێ بڵێی چی بووە ؟

* نا بێگومان عەشوائی نەبووە لەوە دڵنیا بن ئەگەر بەوردی سەیرێکی تابلۆکان بکەین لەهەموو بوارەکان و لە هەموو پارچەکاندا کە سایەتیمان هەڵبژاردووە بۆ نموونە گەر ئێمە سێ گۆرانی بێژمان دانابێ ئەوا هەر یەکەیان لە بەشێکی کوردستانەوە بوون ، وە دیارە کەم وکورتی هەیە کسایەتی زۆریشمان دانەناوە بەڵام دیسانەوە ئەمەش لەبەر نەبوونی ئیمکانیەت و توانای مادی و تەسکی ماوە و نەبوونی زانیاری و وێنەی پێویست لەسەریان کە لەبەرنامەشماندا بوون بەڵام ماوە مان نەبووە کە تەواوی بکەین .

سرووت : ئایا سەبارەت بە هەڵبژاردنی کسایەتیەکان لەبوارەکانی سیاسی و نەتەوەیی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگییەوە بوون ئایا مەبەست لەم تەنەوعە بۆچی ؟

* ئێمە لێرەدا کە هەرچەندە تاکو ئێستاش ئەم وتووە ئێمە ئەو پێشانگایە هەر لەناوەکەی خۆیدا کە دیدارێکە لەگەڵ مێژوودا وە مێژووش هەموو بوارەکان دەگرێتەوە وە ئەگەر لێشم قەبوڵ بکەن هەموو بوارەکان بە باشو خراپەوە ئەگرێتەوە چونکە یەکێ لە دروشمەکانمان ئەوەیە کە گرێ دانەوەیەکی هەمەلایەنەی مێژووی نەتەوەیمانە لەبەر ئەوە ئەو گرێ دانەوەیمان بەهەموو بەشەکان و هەموو بوارەکانەوەیە نەك تەنها لە بوارێکدا یان لەشوێنێکدا .

سرووت : دیارە هەموو میللەتێك کسانی نیشتمان پەروەر و تێکۆشەر و کسانی خیانەتکار و دوژمن بە نەتەوەی تێدا هەڵکەوتووە ، ئایا بەنیاز نین پێشانگایەکیش بکەنەوە بۆ ئەو کسایەتیە خراپ و نارێك و دوژمن بەگەلانەدا و تاکو بە نەوەی نوێی بناسێنن و بیاغەنە روو چونکە بێگومان ئەوەش مێژووە ؟

* تا ئێستا بیرمان لێ نەکردوتەوە وە بەڵام ئەوە یەکێکە لە ئاواتەکانی خۆم کە هەمووشتێك وەك خۆی بگێڕینەوە وەهەموو وەك خۆی باس بکەین ئێمە کسانی خراپ و باشمان لە مێژوودا هەیە ئەکرێ ئێمە سوود لە خراپیش و لە باشیش وەربگرین .

سرووت : وەك لەسەرەتاوە ئاماژەتان پێداوە بەوەی کە پێشانگاکە لە هەولێریش نمایش دەکرێت بەڵام وەك دەبینین لەسەر پۆستەرەکە بەرواری نمایشی لەهەولێر دانەنراوە ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە سەرتا بڕیار وابو بیبەنە هەولێریش بەڵام ئێستا بە ئومێد نین بیبەنە هەولێر ئایا راڤەت بۆ ئەمە چییە ؟

* من رێزم هەیە بۆ ئیدارەی هەولێر هەڵبەتە لەگەڵ ئیدارەی هەولێردا قسەم نەکردووە بەڵام هەوڵێکمان دا لەگەڵ بەرێوە بەرایەتی هونەری وەزارەتی رۆشنبیری ئیدارەی هەلێر دا من پێم وایە ئەوەی کە بەرێوەبەری بەشی هونەری رووبەرووی کردینەوە ئەو قسانەی کە ئەو کردویەتی دڵنیام کە بەرێز وەزیری رۆشنبیری هەولێر ئاگای لێ نییە وە ئەگەر ئاگاشی لێبێت ئەبێت ئیجرائاتی خۆی بکا لەگەڵیدا ئێمە پڕ بەدڵ حەزمان کردووە هەروەك چۆن لەسلێمانی دایە و دەیبەینە کەرکوك ئاواش بیبەینە هەولێر ئەگەر بۆمان بکرایە و بەدەستی ئێمە بوایە حەزمان دەکرد بمانبردایەتە دیار بەکر و سنە و قامیشلی .

سرووت : وەك لە چارپێکەوتنی گۆڤارەکەمان لەگەڵ بەرێز مامۆستا فەتاح زاخۆیی دا بڕیاری دا کە ئەم پێشانگایە بکرێتە پێشانگایەکی هەمیشەیی و بەردەوام نمایش بکرێت لە هەولی کتێبخانەی گشتیدا وەك مۆزەخانەیەکی وێنەیەی ئایا ئێوە هەولێرستان بەرامبەر ئەو بڕیارە چییە ؟

* پێم وایە مامۆستا فەتاح زاخۆیی بڕیارێکی زۆر دڵسۆزانەی دا هەم لەلایەکەوە دڵخۆشی تێدا بوو بۆ ئێمە وهەم خزمەتێکی گەورەی کردووە بە مێژووە نەتەوەی کورد .





جێگەی ڕێز و ستایش و خۆشحاڵییە بۆ ئەوەی داهاتو کە ئەو توانی لەبڕیارێکی لەو جۆرەدا زۆربەی هەرەزۆر کەسایەتیە ناودارەکانی گەلەکەمان لە شوێنێکدا ئیحتیفاز پێوە بکرێت کە ئێمە ئەو شوێنەمان نییە وە زۆر سوپاسی دەکەین.

سروەت : تۆ وەك خۆت کە هەڵساویت بەکۆکردنەوەی زانیاریەکان و ماندوو بوونی خۆت تا چەندە لە کار و ماندوو بوونی خۆت ڕازیت ؟

* من حەز ناکەم هەرگیز بەشتی خۆم بڵێم ڕازیم چونکە تەوحی مرۆڤ زۆر لەوە زیاترە کە پێشکەشی دەکات ، هەڵبەتە منیش پێش ئەوەی کەسێنەی قسەی لەسەر بکات من خۆم باس لە کەم وکوڕیەکانی بکەم لەوانە ساڵنامەی سیانیان نەنوسرابوو وە ژمارەی تابلۆکانیش زۆر کەم بوون لەوەی کە خۆمان بەتەمابووین دایبنێین کە ئەمەش دیسانەوە یەگکێکی ترە لەکەم کورتیەکان کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ باری دارایی و دەست کورتیمان وە دەستی یارمەتیشام برد بۆ زۆر لایەن بەلام یەك دوولایەن نەبێت بەدەنگی داوکەمان نەهاتن لەوانەش کە هەقە باسیان بکەم یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان و پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان و بەڕێز شەخصی د. فایەق گوڵپی بوون .

سروەت : ئایا کەئێوە باس دەکەن لەوەی کە کەس وەك پێویست نەهاتووە بەدەم کارەکانتانەوە ئایا ئێوە خۆتان پێشتر موفاتەحەی ئەو لایەن و کەسانەو حکومەتی هەرێمتان کردووە یان ئەمە ناهەقی دەرهەق بەوان دەیڵێن ؟ وە ئایا ئەو هاوکاری نەکردنە ناگێڕنەوە بۆئەوەی کە پرۆژەکەتان حیزبی نەبووە مۆری لایەنداری پێوە دیار نەبووە ؟

* هەڵبەتە موفاتەحەی وەزارەتی ڕۆشنبیریمان نەکردووە بە ڕاستە وخۆ لە دوای پێشانگاکە ئەوان هاوکاریان دەرکەوت ، بەلام چوینە لای چەند لایەن وکەسایەتیەك پێمان وتن و پرۆژەکەمان خستە بەر دەستیان کە بەحیزبی نەتەوەییەکانیشەوە ئیستیجابەیان بۆمان نەبوو.

وە سەبارەت بەبڕگەی دووەمی پرسیارەکەشت بەڵێ ئەوە یەکێك بووە لە خاڵەکان ئێمە دەمان ویست هەروەك چۆن هەر چوار پارچەکەی کوردستان بەیەکەوە گرێ دابویەوە ئاواش چەند حیزبێك وەك برا دەستیان بخستایەتە دەستی یەکەوە و بیری تەسکی حیزبایەتیان نەکردایە و پێکەوە بمانتوانیایە خزمەتێك بکەین ، بەلام دیسانەوە ئەوە دەڵێم بەداخەوە ئەو هەوڵەمان نەهاتە دی و شکستی خوارد .

سروەت : بۆ پێشانگاکە چیت هەیە ؟

* حەز نەکەم ئەوە خەڵك بیڵێ ...

سروەت : ئەی دوا ووتەت بۆ گۆڤارەکەمان ؟

* هەڵبەتە ئەوەی کەمن لەسەرتاوە دەبوایە بم وتایە ئەوەیە کە گۆڤارەکەتان یەکێکە لە گۆڤارە باشانەی کە ئەتەانێت بەراستی خزمەتی باش بکات لە هەموو بوارەکاندا وە لەم پێشانگایەی ئێمەشدا بەراستی هاوکاریەکی باشیان کردین و لە پێش کەوتندا بن.

سروەت : دواجار ڕوومان کردە بەڕێز " شەماڵ عوسمان " جێگری سەرنووسەری گۆڤاری



سروەت و بزانین ئێوە وەك ڕۆژنامە نوسێك و کەسێکی ئیعلامی ئەم پێشانگایە چۆن دەبینیت

* دەتوانم بڵێم بەراستی ئەم جۆرە کارانە زۆر گرنگ و پێویستن بۆ ئەم کاتەی ئێستامان کە بەراستی کورد لەم کاتەدا زیاتر پێویستی بەکاری لەو جۆرەیە ، ئەمە لەلایەکەوە من دەمەوێت لەڕووی ئیعلامیەوە لە کارەکە بدوێم چونکە پێم وایە بەشدار بوانی ئەم ڕیپۆرتاژە باسی لایەنەکانی کۆمەلاتی و هونەری وسیاسی یان کردووە نامەوێت منیش دووبارەی بکەمەوە، من دەڵێم کارێکی زۆر جوان و دانسقەیە کە کەسێکی ئیعلامیەوەك کاك ئاسۆ و کەسێکی شێوەکاری وەك کاك بێدار هەوڵەکانیان ئاوێتە کردووە دەبینین گوڵێکی ئاڵی لێ پێکەیشتووە گەر بهێڵن و چاوی لێ بکرێت دەتوانریچت بکرێتە سەرتایەك بۆ کاری واهاوبەش لەنێوان گشت چینە جیاکانی کۆمەڵگەی کوردەواریدا ، چونکە بەراستی تاکو ئێستا کاری واهاوبەش لە دوو چینی جیا ئەنجام نەدراوە . لەکۆتایدا سوپاس و دەسخۆشی لە هەردوو بەڕێزان دەکەمەوە و هیوای کاری تر و بەرهەمی تریان بۆ ئەخوازم خەرمان بەرەکەت و دەستان خۆش بێت .

سروەت : دەمەوێت لە کۆتایدا ئەوە بڵێم کە تاکو ئێستا بەرهەم و پێشانگای لەو جۆرە لەکوردستاندا نەکراوە چونکە گەر بە وردی سەیر بکرێت دەبینین هەروەك بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری ووتی ئەمە وەك مۆزەخانەیەکی وێنەیی وەهایە ، جا وابزانم تاکو ئێستا لەکوردستاندا لە جۆرە مۆزەخانەیە نییە هەربۆیە بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری بڕیاری دا بەوەی کە ئەم پێشاناگایە بکرێتە پێشەنگایەکی هەمیشەیی واتە بەردەوام دابرنێت ئەویش بەدانانی لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی کە دواتر ژیاننامەیان لەپاڵدا بنوسرێتەوە وە کەسایەتی تریشی بۆ زیاد بکرێت ، جا ئەمە بەداخەوە بوە هۆی ئەوەی کە هەندێ هونەرمەند تووشی ناحەرەتی کردبێ ئەویش لە دیدگای خۆ بەزل زانین و هەر خۆ بەهونەرمەند زانینەوەیە بۆیە کاتێك خۆم کە ویستم دیدارێك لەگەڵ یەکێك لەو هونەرمەندە شێوەکارانەی‌کە ئامادەی بینینی ئەو پێشانگایە بوو سازبدەم ئەویش کاتێ کە خۆی کرد بەژووردا لە گەڵ چەند کەسێکدا بوو سەرەتا زۆر بۆ ئەو پێشانگایە وئەو کارە هونەریانە سەرسام بوو وە بە هاوڕێکانی دەوت ئەمە یەکەم جارە شتی وا جوان و بکرێ بەتایبەتی کە پەیوەندارە بەمێژووە گەلێکەوە وپاشان کاك بێدار چووەلای و باسی ئەوەی بۆکرد کە مامۆستا فەتاح زاخۆیی بڕیاری داوە کە بیکاتە پێشانگایەکی هەمیشەی و لەهۆڵی کتێبخانەی گشتیدا بەردەوام نمایش بکرێت ، ئەو هونەمەندە شێوەکارە ! دەست بەجێ گۆڕا بەگۆشەی ( ١٨٠ ) پلە و پاش کەمێك بێ ئەوەی تابلۆکانی تر ببینی‌هۆڵەکەی جێهێشت ئێمەش ڕووی ریکۆردەرەکە و زومی کامیراکەمان ئاراستە کرد و ووتم : بەڕێز کاك .... تۆ وەك هونەرمەندێکی شێوەکار و بەرپرسی ...... ڕاو بۆچونت و هەڵسەنگاندنت چیە بەرامبەر ئەم پێشانگایە ؟ بەڕێزی لەوەلامدا زۆر بەئەسپایی و بە چرپە ووتی تنا زۆ سوپاس نامەوێ لەسەری بدوێم چونکە پێشانگایەکی زۆر هیچە و ئەوەنییە کە من !! لەسەری بدوێم و وە کاك بێدار هاوڕێمە و با لێم زویر نەبێت و پشتی تێکردم وهەڵهات و ڕۆیی .جا لەو کاتەدا برای وێنەگری گۆڤارەکەمان کەمێك کاری هەبوو لەو ساتەدا ئامادە نەبوومنیش بە کوڕی کاك ئاسۆم ووت کە تا وێنەگرکەمان دێتەوە دووێنەی من و ئەو هونەرمەندە شێوکارە بگرێت لەکاتی دیمانەکەدا دیارە ئەویش باش گوێی لە هەڵوێستی ئەم برا هونەمەندەی هاوڕێی باوکی بووە !! منیش دەڵێم گەر بەراستی هونەمەند بویتایە و ڕەخنەی واقیعیت هەبوایە ئەبوایە ڕەخنەی خۆتت بگرتایە نەك رابکەیت ئەوە نیشانەی بێ توانایی خۆت دەردەخات کە ئەم جارەیان تۆبەشداریت پێنەکراوە لەکارێکی ئاوادا کە نەت زانیوە ئاوا دەنگ دەداتەوە وە ئیتر ئەوەی تری هەڵ دەگرم بۆ هاوڕێیانی هونەرمەند !! خۆی و خوێنەران کە حوکم بدەن لەسەری و برام مەرج نییە ئەوەی ناوی زل و پلەی بەرزی هەبێت ئیتر هەموو شتێك بێت ئەو عەقلە عەقلێکی زۆر کۆتە و بەسەر چووە ......




# دیدارێک لەگەڵ شێوەکار ( محەمەد فەتاح ) دا



**سازدانی : پ - سروود**

**خوێنەری ئازیز وەک لای هەموان دیار وئاشکرایە کە هونەری شێوەکاری لەهوموو زەمان سەردەمێکدا کاریگەری خۆی هەبووە وە دەتوانین بڵێین کە زمانحاڵی واقیعیەتی کۆمەڵگایە ، وە هەمیشە جێدەستی دیار بووە لەو بوارەدا ، وە گەلی کوردیش دیارە لەم بوارەشدا ڕۆڵی هەبووە چەندین شێوەکاری بەتوانا و بەکەفائەتی تیادا هەڵکەوتووە و بەردەوامیش تێدا هەڵدەکەوێت ، جا ئێمەش وەک ئەرکێکیخۆمان کە قەرزار باری هونەری شێوەکاری ین کە تاکو ئێستا بەپێی پێویست لەسەری نەدواوین ، بەرێزان بۆ کەمیک چوونە ناو دنیای هونەری شێوەکاری تەعبیرییەوە و بەسەر کردنەوەی ئەو کەسانەی کە لەم بوارەدا جێی دەستیان دیاربوو سەردانی شێوەکار کاک ( محەمەد فەتاح ) مان کرد و دواندمان بەڵام بەدوور لەو دیدارە تەقلیدیانەی کە هەمیشە ئەنجام دەدرێت .**

**محەمەد فەتاح لەدایک بووی ساڵی (١٩٦٥ )ە لە شاری سلێمانی لە بنەماڵەیکی کوردپەروەر وشۆڕگێر ، وەتەمەنی منداڵی لە گەرەکەکانی قەرەجاواو وشێخ موحیدین بەسەر بردووە ، وەپاشان خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و پاشان قۆناغی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەر سلێمانی بەسەرکەوتوویی لەساڵی ١٩٨٥ دا تەواو کردووە ، وە چەندین پێشانگای هاوبەش وتایبەتی کردۆتەوە وە شەرەفی ئەندامێتی لە چەندین گروپ وکۆمەڵەی هونەری دا هەبووە وە بەردەوام بێ پشوودان کاری کردووە وکار دەکات ، بۆیە بە پێویستمان زانی دێنییەکی بکەین و ئەم دیمانەیەمانەیەمان لە گەڵیدا سازکرد .**

*سروود : سولیالیزم سەری هەڵدا وەرد تاچەند ( محەمەد فەتاح ) بەژیانەوەی ئەو لەکوردستاندا دڵ خۆشە و چی پێیە بۆی ؟*

**+ سەرەتا سوپاسی گۆڤارەکەتان دەکەم بۆ ئەم بەسەر کردنەوەیە ، هەموو ستایلێك و قوتابخانەیەك تاسەر بەردەوام نابێ چونکە بوونی ئەو پەیوەستە بەزەمەن وسیاسەت و گۆڕانکاریەکانی سەردەم ، سوریالیزم وەك ڕێچکەیەك جێگەو پێگەی خۆی پێکا ، لەکوردستانیشدا کە ئێمە دەبینین هونەرمەندانێك کار بە ڕێبازی سولیالیزم دەکەن ، ئاساییە هەڵبەتە ئازادی تاکە کەسی زۆر ڕەهایە و هەموو ئازادن ، من ناتوانم پەیامم هەبێ بۆ ئەوانەی ئەو جۆرە ستایلە پەیرەو دەکەن ، چونکە هەندێجار ئیستاتیکا لەسەرو هەموو شتێکە ، و تەنها چێژبینین لەکارێکی هونەری ئەوپەڕی تێگەیشتنێتی .**

*سروود تەوژمی زانیاری یاخود ئەوەی بەعەولەمەی ڕۆشنبیری ناسراوە تاچەند هونەری ( محەمەد فەتاح ) لەگەڵ خۆیدا خستۆتە بەردەم گۆڕانکارییەکان ؟*

**+ هەموو گۆی زەوی لەئەنجامدا یەك هێڵ بەرێوەی دەبات ، ئەمە شتێکی زانستییە چونکە گەشەکردنی تەکنەلۆژیا و گەیاندن و ئاڵوگۆڕی بیروڕاکان وڵاتەکان نزیکتر دەخاتەوە لەیەکتر ، هەر چۆن عەولەمەی ڕۆشنبیری ، مەسەلەی کار لێکردنیش وجودی هەیە لە هەموو کات وساتێکدا ، زۆر بڕوام بەوە هەیە کەدەبێت هونەرمەند و موتابع بەردەوام ئاگایان لەهەموو گۆڕانکاریەکان بێت لە جیهاندا ، باوەڕناکەم ئەزانێك لە زانایەك باشتر بێت مەگەر خۆمان هەلی بۆ بڕەخسێنین .**

*سروود دەڵێن لەزۆربەی پێشانگاکانی محەمەد فەتاحدا هەندێ لیشی هەیە دووبارە دەبنەوە و دەجوێنرێنەوە ، دەکرێ پێمان بڵێی ئەم جوانەوەیە هۆی چییە ؟*

**+ دووبارەبوونەوە لەکاری هونەریدا بەو سانایینیە کە جەنابتان باسی دەکەن لێرەدا ( ستایل ) هەیە نەك دووبارە بوونەوە .. ستایل ئەو ڕێچکە کارکردنە پراتیکیە هونەرییەیە کە ئیلتزامێکی توێژینەوەی لە پشتەوەیە وەك من کە کاری هونەری ( ئەبستراکت ) دەکەم ئەگەر تەنیا باس لە ( زەمەن ) بکەین ئەم خۆی لەخۆیدا جووینەوە نییە بەقەدەر ئەوەی هەیە کەئامادەنییە یەك دێڕ بنووسێ یا یەك لاپەڕە بخوێنێتەوە لەژیانیدا و هەر کاردەکات ( لە هونەردا ) ئەمە لێرەدا دەبێتە مایەی ( تکرار ) و جوینەوە ... بەڵام وەك پێم ووتی لەڕووی فەلسەفیەوە زەمەن کەفیلە بەگۆڕینی ووشەکان ........**




*سروودت : گۆڤاری ( ڕەنگ ) ئەو گۆڤارە بوو کە کۆمەڵێ هونەرمەندی شێوەکار لەدوای ڕاپەڕیندا دەریان کرد ، یەکەم ژمارەی بەئیفلیجی لەدایک بوو وە هەر بەئیفلیجیش مرد ئایا ( محەمەد فەتاح ) تاچەند پەیوەندی بەمەوە هەبووە ؟ وە چۆن و وە بۆ لەبار برا ؟ وەکێ بووە هۆی لەباربردنی ؟*



+ پێم وابێ من گۆڤاری ( ڕەنگ ) م نەدیوە داوای لێ بووردن دەکەم ، بەڵام گۆڤاری پەیڤی ڕەنگ کە کۆمەڵێك هونەرمەندی لەخۆبردوو و خاوەن ئەزموون لەگروپی شێوەکاری ( هاوڕێیانی شێوەکار ) ساڵی " ١٩٩٣ " دەریان کرد هەنگاوێکی گەلێك باش بوو و خۆزگە بەردەوام دەبوو ، وە بە ئیفلیجیش لەدایك نەبوو بەڵام نەبوونی دەست گیرۆیی و داکەوتنی ئاستی چاپەمەنی ئەوکاتە وای کرد کە ئەم هەوڵە دووبارە نەبێتەوە ، لەگەڵ ڕێزو پێزانین بۆ ماندوانی ئەم گۆڤارە .

من لەنزیکەوە کارم تێدا نەکردووە بەڵام بەکارێکی پۆزەتیڤم زانیوە و زۆرم هانداون لەکاتی خۆیدا بۆ بەردەوام بوون .



*سروودت : ئەوانەی دەریان دەکرد شێوەکار بوون یان نا ؟ گەر هونەرمەندی شێوەکار بوون ئایا محەمەد فەتاحیان لەگەڵدا بووە ؟ وەگەر شێوەکار نەبوون بەڵگەت چی یە ؟*

+ وەك پێم ووتی کۆمەڵێك هونەرمەندی باش وەك " جەزا بەکر ، وەهبی ڕەسول ، سامان کەریم ، سالار مەجید ، مەریوان جەلال ، بێگەرد عوسمان ، دلێر هێمن ، ئاکۆ ئەحمەد ، بەختیار ژین ، کاروان تەیب " لەم گروپەدا بوون و لەم گۆڤارە کاریان کردووە هەموو ئەو کەسانە ئەمڕۆ بەشانازییەوە هونەرمەندی دیارن .

من ئەوکاتە یەکێك بووم لەئەندامانی ( کۆمەڵی هەشت ) کە ئەویش گروپێکی شێوەکاری بوو پاش ( ڕاپەڕین ) لە " ١٢/ ١٢ /١٩٩١ " دامەزرا وچەندین چالاکی لەشارەکانی کوردستاکردووە .

*سروودت : جەنابتان بەکام لەشێوەکارانی جیهان کاریگەر بوی ؟ وە بۆچی ؟*

+ لەهەر قۆناغێکی کارکردندا بەکەسێك کاریگەر دەبیت بۆ نموونە پێش ئەوەی بچمە پەیمانگا بەکارەکانی هونەمەندی ئیتالی ( لیۆناردۆ دی‌ڤینشی ) کاریگەر بووم و پاشان لەژیانی دیراسە لەپەیمانگە بەکارەکانی هونەمەندی فەرەنسی ( ئێدوارد مانی ) سەرسام بووم کە دیمەنی فلچەکانی و جێ هێشتنی بۆ ئەوزەیتە زۆر توشی حالەتی دەکردم و خۆشم دەویست ، پاشتر بەکارەکانی دالی و پۆلۆك و دوستایل و جۆزێف بۆیز وزۆری تر ... دەشێت بەکاری منالێك سەرسام بیم و بیخەمە ناوکارەکانمەوە کە تا ئێستا ناییناسم .. ئێمە هەموو کاریگەری خەڵکی ترمان لەسەرە و تەنها یەکەم مرۆڤ لە بووندا کاریگەر نەبووون بەئەوی تر چونکە هیچی پێش خۆی نەبینیوە غەیری سروشت نەبێ ..کە بەکاری یەکێك موعجیب دەبم ئەوا واتە خۆمی تیا دەبینمەوە .

*سروودت : لە ئیشەکانی خۆت ڕازیت ؟ تاچ ئەندازەیەک ؟*

+ هەرگیز لەکاری خۆم ڕازی نیم ، چونکە ( موجامەلە نەبێت ) ئەوەی دەمەوێت زۆر لەوە ڕەگاوی ترە کە دەیکەم و دەیبینم بەڵام بەوهیوایە دەژیم کە ئەم یەکەم هەنگاوەمە و هەست دەکەم بۆهەزار ساڵی تریش دەژیم .

*سروودت : محەمەد فەتاح چۆ بیر دەکاتەوە لەهونەری شێوەکاری لەسەر بنەمای بەرژەوەندی مادی یان مەعنەوی ؟*

+ هونەری شێوەکاری وەك هونەر لەهەموو جیهاندا هونەمەند لەسەری دەژی و دەبێتە مایەی خۆش گوزەرانی ئەوکەسە وەلێ لەوڵاتی ئێمەدا گەر تابلۆ بفرۆشیت و پیی بژیت باشە بەڵام کێن ئەوانەی دەیکڕن و بۆچی دەیکڕن ، مەسئولێك بۆ داپۆشینی دیوارێکی ماڵەکەی یاخود لەبەر چاو لێکەری و ڕوگیری تابلۆیەك لەهونەمەند دەکڕێ . ئەمانە کڕیاری ڕاستەقینە نین و تەکان نادەن بەبزافی کڕین وفرۆشتنی کاری هونەری ، من ئومێدەوارم بتوانم لەڕێگە فرۆشتنی کارەکانمەوە بژیم بەڵام لێرەدا هێندەی کارێکی واقیعی سروشتی ودیمەنێکی لادێو دەستارێك دەفرۆشرێت ئەوەندەی کارێکی هونەری ( هونەری ) نافرۆشرێت ، چونکە ئەو کەسەی دەیکڕێت ئامادەنییە کەمیوانێك ڕووی کردە ماڵەکەی بتوانێت بکەوێتە گفتوگۆ بۆ ئەوەی ئیسپاتی بکا بۆخۆی و ئەو کە ئەمە هونەرە ... لەبەر ئەوە باشتر وایە دیمەنی شاخ و داخێك هەڵواسێت ، ئەمە کەم کردنەوە نییە لەو خۆشەویستیە هونەرمەندانەی کە کاری واقیعی دەکەن نەخێر کەمن ئەبستراکت کارم کرد زۆر لەبەرامبەرەکەم ناکەم وەك من بێ ، بەڵام دێمەوە سەر کڕیار خۆزگە کڕیار دەیزانی چی وبۆچی ئەو کارە هەڵدەبژێرێت .

من بەش بەحاڵی خۆم ئەگەر هیچ تابلۆیەك لەهەموو ژیانمدا نەفرۆشم ، لەهونەر ناوەستم .

*سروودت : وەک وەفایەک چ ووتەیەکت هەیە بۆ ڕۆحی ( سەروەت سەوز ) ؟*

موحومەد فەتاح
دەنا کە من دەڵێم هەست دەکەم هەزار ساڵ دەژیم ئەشزانم ژیان بەشی قاقای پێکەنینێك ناکات .

+ سەروەتی سپی ڕۆح سەوز هەمیشە زیندو هاوڕێی خۆشەویست و هونەرمەندی بەتوانای گرافیك بوو ، مەخابن تایەی ڕەشی ماشینێك ژیانی سەوزی هونەرمەندێکی دەم خەندە هەڵ ئەوەرێنێت ، هەرچی‌یەك بڵێم ناگاتە جوانی و میهری ئەو کەسە ...

*سروودت : دوا ووتەت ؟*

+ سوپاس بۆ ئێوە ، پێم خۆشە بابەتی هونەری لەمەزیاتر بێتە ناوگۆڤارەکەتان ومرۆڤ بەخۆشەویستیەوە ژیانی خۆشە ، بافێربین یەکترمان خۆش بوێت ، دەنا کە من دەڵێم هەست دەکەم هەزار ساڵ دەژیم ئەشزانم ژیان بەشی قاقای پێکەنینێك ناکات .

*ئێمەش لەکۆتایدا زۆر سوپاسی بەڕێزت دەکەین هەر سەرکەوتوو بیت .*




# ئیلفریدی یلینک ی نەمساوی خەلاتی نۆبلی لە ئادابدا بەدەست هێنا

هێلین جوانرۆ


ئیلفریدی یلینک

ئــەکادیمی ســویدی ڕۆژی " ٨ . ١٠ . ٢٠٠٤ خەلاتی نۆبلی بەخشیە " ئیلفریدی " بۆســالی " ٢٠٠٤ " ، ئەمەش وەك بەهەند گرتنێكی ئەو بەرهەمــە زۆرانــەی لــە ( فیــض موسیقي للأصوات و أصــوات مضادة ) دا .

وە ئەکادیمی سویدی ئەوەشی ڕون کردوە کە ئەو خەلاتەی بەخشیوەتە ( ئـەلفریدی ) لەسەر بنـەمای ئەو بەرهەمە ئەدەبیەی کە بەشێوەیەکی دانسقە وخودکردی پـەردە هەلدەمالێت لەسەر ئـەو دیمەنە کۆمەلایەتیـە نەمطیـە كـەی و نفوزە زیادە ڕەوییەکەی .

یلینك لـەدایکبووی ( ٢٠ ی ئۆکتۆبـەر/ تشرینی یەکـەمی ١٩٤٦ ) ە لەشاری ( موزروشلاغ ) لـە باشوری نەمسا لـە خـێزانێکی جولەکە ، وە لەتەمـەنێکی زۆر پێش وەختی دا چـەند وانەیەکی لە مۆسیقا ودانانی مۆسیقا لە پەیمانگای ( ڤیننا ) بـۆ مۆسیقا وەر گرتووە ، وە لـەدوای بەدەسـت هێنـانی بڕوانامـەی بەکاریلیوس لەسالی " ١٩٦٤ " دا بەردەوام بووە لە وانەکانی شانۆ و مێژووی و هونەرەکان لەزانکۆی ڤیننا کە هاوکـات بـەردەوامیش بووە لە خوێندنی لەبواری مۆسیقادا .

وە ئەلفریدی بەردەوامژیانی بەسەر بردووە لە جێگۆرکێیدا لـە نێوان نەمسا و ئەلمانیادا وە لە و بارەدا ژیاوە .

لەدانراوە ناسراوەکانی ( العشاق ١٩٧٥ ، المستعبدون ١٩٨٠ ، عازفە البیانو ١٩٨٣ کـە ئەمـەیان ڕیوایەتێکـە وفیلمێکـی سینەمایی لێوە وەرگیراوە وکراوەتە فیلم لە سالی ٢٠٠١ دا .

سەرچاوە / ئاژانسی ڕۆیتەرز + ئاژانسەکان

# مایکل مور کاندید کردنی فیلمی " فرهنهایت ٩/١١ بۆ خەلاتی ئۆسکار ڕەتکردەوە

شنۆ عوسمان


مایكل مور

دەرهێنەری ئەمریکی " مایکل مـور " بڕیاری دا کە فیلمە سەرنج ڕاکێشەکەی کە بەناوی ( ١١/٩ ) دوەیە پێشکەشی نەکات بۆ کاندیدەکانی ئەکادیمی سینەمای ئەمریکی ( ئۆسکار ) ئەو وای پێ باشتر بـوو کـە بـەردەوام نمایش بکرێت لـە سەر شاشەی تەلەفزیونی ئەمریکی وەك لەوەی بیخاتە نێو ئەو کێبڕکێیەوە بـۆ خەلاتی ئۆسـکار تـاوەکو مـەلاین خـەلکی پێـش هەلبژاردنـە سەرۆکایەتیـەکانی ئەمریکا ببینن .

وە ڕۆژی یـەك شـەمەی بـەرواری ٣/١٠/٢٠٠٤ " مـور " لەسەر پێگەی خۆی لەتۆڕی زانیاریـەکاندا ( ئینتەرنێت ) ووتی : تەنها کێشە لای ئەو بریتیـە لە و ئارەزووەی کە دەیەوێت زۆرترینی ئەمریکیـەکان ئەو فیلمەی ببینن ، هەربۆ بڕیارم دا کە لـە سەر شاشەی تەلەفزیۆن نمایشی بکەم کەئەمەش وا لـە و فیلمە دەکـات کە نـەگونجێ و دروست وئامادە نـەبێت بـۆ کاندیدکردنی بـۆ وەر گرتنی خەلاتی ئۆسکار بۆ باشترین فیلمی دکۆمێنتی .

وە ئەوە شی ڕاگـەیاند کـە ئەو پێشـتر ئەو خەلاتـەی بەدەست هێناوە وە دووبارە بەدەست هێنانەوەی دەبێتە شتێکی خۆشتر لـەلام و لام خراپ نییە ، بـەلام بـاش نیـە کـە جـارێکی تـر وولات بگێردرێتەوە بۆ دەستی زۆرینە .

سەرچاوە / ئاژانسی ڕۆیتەرز

# دەربڕینێکی شاعیرانە بۆ شیعر و جیهانە فراوانەکەی ئەدەب



کاروان قادر

ئەگەر پێشکەوتنی مادی کۆمەڵێ پرسیاری ڕاچڵەکاندبێ ، زۆر ئاساییە بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەی لە ( تێگەیشتنە ئەدەبیەکان کورت بین بێ ) ، بۆ دەست نیشانکردنی وجودی شاعیر لەخانەی سفر دەر ئەبردرێت .

- تۆبڵێ کاتی ئەو جۆرە نووسینە مابێت بەدیار خامە و شەوی تاریکی پڕ لە ئەندێشەو خەیالات بەرهەمێکی پڕئەدەب یان شیعرێکی خاوەن هەست ونەستێکی شاعیرانەوە دەربڕینێکی کەم ، لەمەعاناتی خودی شاعیر وکۆمەڵەی بنوسرێو دلۆپێ فرمێسکی عارەقاوی لەهەناوی سۆزەوە بتکێنرێت .. ئەمە تاکە گرفت نەبووە لە ئێستادا ، بەڵکو گرفتی بەستراوە بەکۆمەڵێ کار تێکەری ووروژێنەر ومێژوویەکی گرنگیشی هەیە لەئەدەبدا هەرکاتێ بەرهەمێکی تری ناوکۆمەڵ بەقورسی و گرانی خۆی نواندبێت لای زۆر لەئەدیبەکانیشمان نرخی شیعریان بەکەم زانیوە .

خۆتەگەر بووترێ : هەرکەسێك بۆخۆی دەستی شاعیری تیادا دەر ئەکەوێ ، وەپێویستیش ئەکات هەوڵی لەگەڵدا بدات بۆ بەرەو پێش چوونی بەهرەکەی تا ببێتە خاوەن ئەزموونێکی گرنگ ، لەگەڵ ئەوەشدا شاعیرێکی وەك ( قانع ) ئەم سکالانەی دەربڕیوە ، هەرکەسێك دەست ئەداتە نووسین بەشیعرەوە خۆی گرێ ئەیات یان چیرۆك ، کاکی برا لاریمان لەوە نییە کێ ئەبێ بەشاعیر وکێ جلەو وەرەوتی ئەدەبی خۆی دەست نیشان ئەکات .

بەلام ئەبێ ئەو پرسیارەش بکرێت ئەی ئەم ( شیعرانە ) چەندێکی خاوەن تایبەتمەندیەکی گرنگە بۆ ئەدەب وچەندیان ئەزموونێکی خاوەن ئەهمیەتدارە یان حەزێکەو دروست ئەبێ ، ئەمە کەمانێك نییە لەبازاری مۆسیقادا گەلێك کێشەو ناهاوتایی هەبێ .

چی تێدایە لەهەر شوێنێك بۆی ئەنووسێ ، ئەمەش سەرە تاڵێکە بۆ کاڵکردنەوەی لەبازنەیەکی تەسك بینیدا ، کەواتە کێشەکە لەوێدا خۆی دەرخستووە ، ئەخوێنێ لەم وولاتەدا ، لەسوچی مزگەوتێکدا لەگەڵ ( نالی ومەحوی ... ) دا ، ئەمانیش بەچەند قوتاغێکدا تێ ئەپەڕن و خوێندنیان لەبەرهەمە نووسراوەکانی زانایانی پێش خۆیان ئەوانیش لەگەڵ ئەو هەموو قوڵ ڕۆچوون و تەنگژە مەعریفیەدا ، ئەیانەوێ بازێك بدەن ، یان لەوێوە دەست پێ بکەن چۆن ئەنووسن ، هەڵبەتە شیعریش سەرچاوەیەکی گرنگی پڕ بایەخی ئەوان بووە .

بۆ دەر والاکردنەوەیەکی کێشەکە ئەوەنییە هەموو بوونەتە شاعیر ئەگەر بەڵێین بێ راست نییە لەم سەردەمەشدا ئەبینی چەندان وهەزاران بەرهەمی بێ پوختەی ئەدەبی ئەکەوتە نووسینەوە .

ڕاستە سەرچاوەکان بۆپڕکردنەوەی کتێبخانە و سەرقاڵکردنی خەڵکی بەم جیهانەوە گەلێ تێگەیشتن ومەفهومی جوانیشی هێناوە ، بەلام ڕاستر وایە کە ئەڵێین(شاعیر و شعر ) ( چیرۆك نووس و چیرۆك ) ئەمانە کاڵ بوونەوەی توخمی ئەدەبیشیان وێران کردووە .

باچەرخاندنەوەیەك بخەینەوە بەردەم ( نالی ) . ئەو وەلامەکەی وایە لەسەردەمی پێش ئەویشدا شاعیر یان شیعرنووس زۆر بوون بەرامبەر بەوەش شەوانە تاڕۆژ ئەبووەوە ئەو هەموو بەرهەمە تۆمار نەکراوەی چیرۆکی کوردیمان لەبیر ناچێتەوە بۆنموونە ( فۆلکلۆر ) خۆتەمەش ئەی سەپێنێ لەهەر دووبارەکەدا کە کەسانی شارەزا ئەسپی خۆیان تاوادارە بۆ نموونە شیعر لە جەنگیشدا سنگی جەنگاوەرانی قایم کردووە چیرۆکیش قەلایەك و پشگیری ئازایەتی لەم شوێنەدا گێڕاوەتەو تا ببنە خاوەن وورەیەکی گەورەی ئەترس .

بەلام پرسیارێکی تریش بەرامبەر ئەنووسینەوەیان ، زۆر ئاساییە پێمان ئەڵێ دواکەوتوویی ونەبوونی چاپ و دەزگای پێشکەوتوو ، لەگەڵ ئەم وەزعەشدا ئەبینی کەسانێکی وەك ( بابە تایەری عوریان ) و ( نالی وسالم .. ) زۆر بەبایەختر سەیریان ئەکرێ ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ لەو بوارە تایبەتمەندانەیان هەر ئەمان لە سەردەمی خۆیان ئارەزووی شیعر نووسین بوون و کەڵکیان لەبەرهەمەکانی پێش خۆیان وەرگرتووە .

بۆ وەلام ئەم ڕەگەزی بەشاعیربوونە لای چەند تاکێکی کۆمەڵگە وەك ئێستا کەسانێك هەبوون بوار بدەن بەلێهاتوویی وخاوەن ئەهمیەتی شیعری ئەوانیش ، نەلەبەر دەرکی ئاغا وداردەستانی دەرەبەگ بوون نەخاوەنی پلەو پایەیەکی مادی بوون .

ئەو ڕۆژە ( نالی ) دانیشتبوو لەکاتی دەور کردنەوەی کتێبەکاندا لەگەڵ ئەودا چەندان کەسی ناو حوجرەکەی لە سەر شیعر ئەدوان وە ئەیانتوانی قەرار بدەن چونکە زۆریان شیعر لەبەر کردبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی چەندین بەرهەمی شیعری بوون کەواتە شیعر نووس یان شاعیر بوون ئەکرێ لەم سەردەمەشدا ئەوەندە بەزیادەوە ئەرکی گۆڤار وڕۆژنامە بوبێتە حاڵەتی تەنها ( مانەوە ) ی هەوڵدان بۆ زیاد سەرنج ڕاکێش کردنی زۆرینەی خەڵك ، زۆر ئاساییە بگرە چەندان کەسیش بەناوی شاعیرەوە سنگ دەر ئەپەڕێنن هیچ دوور نییە هێزێکی پاڵپشتی هەبێ ، لێرەوە دەر ئەکەوێ زەوقی خوێنەر سست ماوەتەوە ناتوانێ حاڵی بوونێکی خێرایی هەبێ بۆ تێگەیشتنێکی ڕەسەن .




لەپاڵ ئەمەشدا ئەوتریَ ( عەصر عەصری تەکنەلۆژیایە ) خەڵکی ( ئەنتەرنێت ) بەکار ئەهێنن ،کاکی برا بەکاری بهێنە ( من بەئەرکی نازانم شاعیر ئەگەر ڕەهێڵەی شیعری تیا کۆبوبێتەوە ، دەست بەرداری بێت و بچێتە جیهانی کارکردن لەگەڵ ئەنتەرنێتدا ) .

چونکە هەریەکە ورێگەیەك و خەڵك خەصلەتێکی تیا بەدی ئەکریَ وەکو چۆن لەکەسانیشدا ئەمە بەجیاواز گیراو ، بۆیە بەپێویستی نازانم لەم پەڕی شیعردا بڕۆێتە ژێر سفری ئەنتەر نێت ، ڕەنگە هەر فێریش نەبێت ، فێر بوون ئەوە نییە دوودوورە ببینیت فێربوون چڕبوونەوە ودۆزینەوە وگەڕانە بەدوای مەملەکەتێکی نامۆدا ، ناحەقم مەگرە ئەگەر بڵێم سبەینیَ هەربیَ تاقەتی بوی بلیت ئەچم بۆ ... واتە بۆ دەرەوە .

دژایەتی هیچ هەوڵێکم پیَتاکریَ ، بەڵام ئەوەش بزانە ئەگەر زەمەن بەسەر چوو بەچ شتێك حەقی بۆ ئەکەیتەوە ئەوەندەی پێت ئەکریَ ئەو دەستەی بردوتە سەر کونجێك خیانەتی تیامەکە لەوە باشترە تازە بگەڕێتەوە سەر حەزێکی منالانە چونکە ئەوەی وستوتە پێویست بووە لە سەردەمی خۆیدا لەگەڵیا بژیت بۆ ئێستا بەنیوە چڵەیی ئەگەڕییتەوە سەر ئارەزووەکانت خۆتەگەر تا کەسیش ڕێت لیَ ناگریَ چۆن ڕائەبوێری ئەرکی خۆتە بائەوەشمان لەبیر نەچیَ بۆ یە شاعیر ... زۆر بوون ، بەئەم دەردە چووە ، لەهەر سوچێك بژی ئەبیَ شیعر بنوسیَ ، لەهەر مالیَ دانیشتبیَ ئەبیَ شیعر لەسەر زوبانی بێت ، چۆتیش بیرکاتەوە هەر ئەبیَ شاعیر بیَ ئەو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەکرێتە پرسیار دووبارە لە عەصری سورعەتدا ( کاتیَ ئەوجۆرە نووسینە نەماوە بەدیار خامە و شەوی تاریکی پڕ لە خەیالات و ئەندێشە ، بەرهەمێکی ئەدەبی یان شیعری بنوسیَ ) بەلام ئەو کۆمەڵە ئەدەب خوازەی ڕۆژ بەڕۆژ توانیویانە بەرهەمە شیعریەکانیان بپارێزن و شێوازی مانەوەشی لەسەر دەستی کەسانێکی پڕپایەخی ئەدەبی وشارەزا بوو .

بیَ گومان کیَ ئەیزانیَ ئەم شاعیرانەی هەتا ئەو پەڕی مێژووش نرخی ئەدەبی کوردی یان بەرزکردۆتەوە ، هەر ( نالی و سالم و مەحوی ومەولەوی ...) بوون بۆ چۆتیەتی پاراستنیش لای زۆر لەمەلا وفەقیَکانی وە ئێستا چۆن دەفتەری ( یادەوەری ) هەیە ئەو کات پێویست وتایبەت بووە بە ئەدەبەوە ئەوەشی ئەنووسرا زۆرێکی لەدوای تاوتویَکردنێکی زۆر ئەنووسرایەوە بۆیە دەستەو دەست بەرهەمی گرنگتر نووسراوەتەوە کە ( ناو ) ی شاعیری زۆرکات دەوری نەبینیوە هەتا ئەو کاتەی زانیویانە خاوەن سەلیقەیەکی ئەدەبی‌یە و گرنگی داوە بە هۆنراوە ، کەواتە ئەو دەمەیش بەتیَپەڕینی زەمەن بەرهەمی کاڵ تۆخ نەکراوەتەوە لەبیر چۆتەوە ، هەستێکی شاعیرانەی پوختیش ئەم ئەرکەی گرتوتە بەر .

دوا بەدوای ئەمەش وێران کاری دواکەوتوویی وڕەشە کوژێنی هەر بەردەوام بووە ، ئەتوانم بڵێم ( ئەوکات پێویستی کردووە کە سێکی لێهاتوو جڵەوی چاکسازی کۆمەڵگە بگرێتە بەر ، زۆر ئەستەم بووە هەردەم بە شیعر ئەنجام درابێت ، بۆیە شاعیر

کەسێکە هەست ناسکی کۆمەڵەکەی بووە گرنگی داوە بەبوارەکەی خاوەنی هیچ دەسەلاتێکی سیاسیش نەبووە ، بگرە جێگەی ڕێزو خۆشحاڵی هەموو لایەك بووە ) .

ئەمەش ئەوەمان لائاشکراتر ئەکات چۆن شاعیران کۆن ماونەتەوە بەرەوتی ئەدەبی خۆیان گوزەریان نەکردووە وکەچی چیرۆك نووس لەو سەردەمەدا هەردەم دەوری هەبووە وەك شاعیر زیاتریش بینیوە چونکە چیرۆك ئەرکی تێگەیشتنی نزیکترە وپێوەرێکە بۆ تیَگەیاندنی خەڵکی ، بەرهەمەکانیش نەپارێزراون لەبەر ئەوەی درێژترە وبەئاسانی لای خەڵك ئاشکرا بووە هەم خەڵك لە تابریا دەستیان ئەکەویَ ئەو کەسەش دیاری نەیاوە بینوسێتەوە تا هەندێکیان بەکەمی ماونەتەوە لەو فەوتاندنە ڕزگاری بووە ، بۆیە ئەبیَ باش بزانین ئەوانەی ئەنووسن بەلێشاو بلاوکراوە ونووسینیان هەیە ، چ جای ئەوەی کۆمەڵیَ دەروازە ئەکاتەوە ، هەرزووش بیَ‌ترخ ئەمێنێتەوە ئەمەش هیچ نرخی ئەدەب و شیعر بەتایبەت کەم ناکاتەوە ، بەلکو گەورەیی و بەرزی دەر ئەخات .






کورتە چیرۆک

# تاوان لە چۆڵیدا



حەمەعەلی کەریم

تازە لادایەکی جوانم کڕیبوو ساڵی ( ١٩٨٧ ) بوو دوای عەسر لە ئەسحابەسپی وەستابووم دووکەس هاتن ووتیان بەچەند ئەمان بەیت بۆ عەربەت ، منیش وەڵامم دانەوە و ڕێکەوتین نەفەرەکانم گەیاند وبە دڵخۆشییەوە پێم پیانا ئەو کاتە نەفەر کەم بوو جا جادەش چۆڵ و هۆڵ بوو منیش چاوەکانم کەمێك کزبوون بەرەو سلێمانی ئەهاتمەوە ، وەتیشکی خۆرەکەش بە ئەندازەی ڕمێکی مابوو ئەیدا لەناو چاوم و ڕێگاکەم بە هەزار حاڵ دەبینی لە پڕ لە دوورەوە چەند مەڕێك بەجادەکەدا پەڕینەوە منیش هێواشم کردەوە تا هەموویان تێ پەڕین تومەس شوانەکە لەدواوە بەڕاکردن ئەیویست تێپەڕێ ، لەگەڵ ئیستۆپم گرت وتەپەم لێ هەستان ، خێرا دابەزیم کە سەیرم کرد تلپی تەڕی تیا نەمابوو تەنها چاوەکانی زەق تێ بڕیبووم منیش کەمێ ئەم دیوودیوم کرد فایدەی نەبوو سەیری ئەم لاو لای جادەکەم کرد کەس دیار نەبوو ، هەرچۆنێك بێت ڕامکێشایە قەراغی جادەکە وە بەهەندێ پوش و پەڵاش دام پۆشی و بەجێم هێشت ، لەدڵی خۆمدا ووتم پێم بزانن توش ئەبم و بەسەیارەکەش لێم ڕازی نابن ، لەمن وایە مردووە ...!!

نزیکەی بیست ڕۆژ بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێ پەڕی بوو منیش بەیانییەك لە دەوری کاتژمێر "١٠" دا لە چایخانەکەی یاسین دانیشتبووم چایەکم لەبەر دەستا بوو ، لەناکاو دووپۆلیس خۆیان کرد بەژوورا و پیاوێکیان لەگەڵدا بوو ، وتی : ئەمە بوو .

کەسەیرم کرد حەپەسام ، کابرا بوو کە بەسەیارەکە لێم دا بوو ، لەخۆشی ئەوەی کە نەمردبوو و لەترسی ئەوەی کە ئەمزانی ئەگیرێم ، وتم بۆچی ........... ماوی ، لەدوایدا کابرا لێم خۆش بوو وە منیش هەقی ئەوەی کە بەجێم هێشتبوو شەش مانگ حوکم درام .

## حاجی داماو

حەمەعەلی کەریم

بەیانی زوو حاجی داماو
خەو لە چاوانی زراو
وەك هەژاری بێ ناو و نان
لەگەڵ کازیوەی بەر بەیان
بۆسەر بینای تازە هەستاو
ریش شێوا و چاو ئاوساو
لەڕویا دیار بوو بێ خەوی
دالغە و لێ تێکچوونی شەوی
کۆشك ودوکان بێ شومار
ئەمیان لەناوەڕاستی شار
جێگای خانوی کۆن بوو کڕی
دەستی خاوەنەکەی بڕی
لەهەچ کوێ زەویەك دیار بێ
لەم سەر یان لەوسەر شاربێ
حاجی تەماعی تێ ئەکا
ناسرەوێ هەتا پێی ئەگا
ڕۆژێ سەیر لەوەدا بوو
بەلای ئەرزێکدا تێ پەڕیوو
خێرا لە پیاوێکی خوڕی
ووتی بەچەند بێ بۆم بکڕی
ووتیان قوربان ئەم زەویە
بایی دوو ملیۆن دۆلارە
شوێنەکەی گەلێ دڵگیرە
تەواوی شاری لێ دیارە
گەورەم ئەم زەویە جوانە
دووساڵە هی جەنابتانە
حاجی خەریك بوو باڵ بگرێ
دەزانێ هەرگیز نامرێ
نازانێ گە نجینەی قارون و
تەمەنی نوح تاسەر نی یە
بەشی ئەمیش وەکو خەڵکی یە
تەنها دوو مەتر زەوی یە




# شەوێك لە عسیان



بەرزان مەلا تەها

کەسێ شوغلی موحیبەت بێ ئەبێ وەصلی بەحەق تەحقیق
صەباحەت یێت بڵێم خاڵی لــەهــەر نــوکتە ومــوعــومــایە

*شێخ عومەری زیادەدین*

لەکەنار شەوێکی خامۆشا
دڵ حەزینم ، لەمەیدانی تاریکی ئاسمانا
ئەگری وئەبریسکێ
مانگیش لەنێو باخی ئاسمانا
نازو شوعلە ئەبەخشێ
شەویش نوقمی زیکر وتەهلیلەی
دەروێشان بووە و وێنەی شەوی قەدر ئەبەخشێ
ئاهی دڵی عاشقان نوکتە نوکتە
دەفتەری رەشی ئاسمانیان ، بەعیشوە و نازی دڵیان
بەبروسکەی حیکمەتی عیشقیان
پۆشیوە و زاهیدانە ئەدەن تەڵقینی مەعسیيەتی ئەمشە و
منیش روسیا و بەجێناوی کاروانی عیشق
رو نەردی دیوان و حەلقەی دائیرەی عیشق
چی بکە مەکفنی خەجاڵەتی مەعسیيەتی ئەمشەو
بەدەم ئەشکی تاوانەوە
شەرمەزار و دڵ بریندم
لە بۆ وەصلی حەقیقەتی مەحبەبەتی ئەمشەو
ئەکەم ناڵە
ئەکەم مەجون
ئەبەم سوجدە

## بەردووی ساباتە بابردووەکان

بەشی دووەم

م.تاریق ئەحمەد

سەروەری سێبەری نسار
جێی ژوانمە ..
وەکو قوڵتە لانەم رەقە و
لەچاوی ناحەز زەقترم ..
لەئامێزی چەمی رەزان
شێرە بەرەو کانی زانم
بێباکترم ...
نا ناهەرگیز !!..
وەك کۆترە باریکەی هەژاران
بەکلکی رێوی هەڵنافریوێم ..
یان بەوێنەی نووکە پێنووسی چاو شۆڕ
میکیاجی رووی ستەم ناکەم ..
نا بمە مەقاشی ئەم ئەو و
پشکۆی درۆ
بۆخەندەی ئەو
لەبەری خەرمانی رەنجی ئەم بەرنادەم ..
لەوەتی هەم
تاج ونەجمەو خەت وخاڵی
هیچ زەبەلاح و زلحۆرتێکم
نەژماردووە ...؟!
کەچی دەزانم پەپولە
چەند چاوو
مێرووله چەند پا ...
کڵاوی پەپو سلێمانکە چەند برگەو
زەمیلەیەك هەنگ چەند ماك و شا ...
کەو چەند خەت و
خاڵی ومالی چەند خاڵی
لەسەر پشت وشان سینگ و
چەند مەدالیای
بەگەردن و دولا جەنگ و
بەروکی دا هەڵواستراوە ؟! ..
ماڵی سوێسکەو سمۆرە وکەناری
بەوێنەی لانەی پاسار
رۆخی نیرگەی
یان کۆلەکەی بەر هەیوانی




مالی باپیرم شارەزام ...
کەچی تاکو
ئێستا کەشی لەگەڵدابێت
مەگەر لەژێر نێری زنجیر و کۆت و بەندا
سەرم بەدەرك و کۆشك و قەڵای
" باستیل " انی
ئەم ڕۆخەدا کردبێت و
دانە دانە ، پەنجەرە چاو کوێرەکانم
ئەژمار دبێت ...
جۆری دەسك وکلك و پرژی
ناو چاوگرژی
قامچەکانم شوناسایی کردبێت ...
بەسەدان جار
وانەی خانەی گاز وغاز و پلایس و
پەت وحەبل وبەن و گوریس و
کایەی کاویەی
دیاری دەستی پۆست مۆدرێنم ...
لەسەر هەمان سفرەو خوانی
هێلکە شەیتانۆکەی دوێنێ
دەست لەملانی یەك بینەوە ؟! ...
کەچۆن وەك دوژمنێ
بۆنیشتمان پەروەرانیان ڕوانیوە ...
لەئێوارەی
سێ شەممەیەکی وەنەوشەییدا ..
سێ بڕیاری
بەکار وسەلار و ریشەداری ..
قوت وەك لوتکەی جەنگە ژاڵ و
قوڵ وەك شیوی ناوەرەم دا ...
یەکەم بڕیار
هەتا ماوم ، هیچ
پۆستاڵ ڕەشێ
کە جامی پڕی زامی دوێنێ
دێنێتە سوێ
نەدوێنم ...
دووەم بڕیار :
هەتاکو مان ، هیچ
پەپولەیەکی بێ چرپە و
بولبولێکی دەنگ لە پەڕەی گوڵ ناسکتر
نەبوغزێنم ...
سێهەم بڕیار
هەموو مێشێ
مادەم لەبەر دەرکی لانەی
مێو دراوی نەپشکنرێ
بەهەلاڵەی بێ ژار پاك چن

# وەرن قورئان تەماشاکەن

شێخ کەمال شێخ نوری

نەترسم گەر لەرێش وشاڵ ومێزەر
دڵم دەیدا بەزارم زێڕو گەوهەر
لەتاو زووانی بەوی ئەوسێ بەلایە
چەنی ژێرەم زرم وەک داری بێ بەر
لەترسی وان نەبێ بۆچی تخنکێ
لەنێو مێشکایە پەیامی بەرزی باوەر
لەرێی هاتو نەهاتا هاتوچۆم کرد
لەکۆن ونوێ و نیواشتم نایە سەر سەر
جلی تانەم بڕی و هەر کۆنە پۆشم
لەبەر تانە و پلاری شێخی بێ فەر
جنۆکە گەر نەلێم سەربازی شێخە
دە یا دێو و درنج بۆی بوونە رەنجبەر
زەندیق وکوفر وخوا نەناسی
بەرەو ڕووم دێ لەبن پێوە هەتا سەر
بڵێم گەر دابەزی ئینسان لەسەر مانگ
مەلا دەم باڵەدا لێم چەشنی خەنجەر
لەکن ئەو نوێ نیشانەی رۆژی حەشرە
لەوان دووانی مەگەر مابێ بەدەفتەر
مەبەستم کۆلکەیە ئەمما مەلای چاک
خەلاتە کەوشی گەر دانێم لەسەر سەر
بەلایە نەک مەلا ناوان و بێ فام
نەتامی هەس نە بۆنی هەس نە سێبەر
بەباسی خوێندن و فێر بوونی ئافرەت
لەکێشەی مامە صۆفی گوێ ئەبێ کەر
ئەلێ کوا دین ؟ کە کچ بڕواتە مەکتەب
دیاری دا نیشانەی رۆژی مەحشەر
لەمەش داخۆ گوناهی کاک مەلایە
کە بێ دەنگە لە فەرمانی پەیامبەر
ئەگەر بدوێم لەخواناسی بەڕاستی
گڵێ هەرزە گوشندەی خاڵی دولبەر
لەبەر بەد نەفسیان دیسان ئەوانیش
وەکو شێخ و مەلا لێم دێنە سەنگەر
لەوان وایە لەسەر فەرمانی دینە
جەنابی شێخ لەخوێندن نەهێەکا گەر
وە یا فەرمانی خوایە خەڵک هەژار بن
برێکیش ببنە ئاغا و شێخ و بەگلەر
مەلاش هەر أشهد بالله یە بۆ شێخ
لە دیوانی بەگیشا بۆتە نۆکەر
یەکێ دنیا پەرستی ببنە پیشەی
مەرو موڵک و دراو دانێ بەباوەر
درۆیە شێخ نییە واتێ ئەگەی ئەت
ببێتە نیشتەجێی سەردار و رابەر
چی ئاینێک لەگەڵ زۆڵایە تۆ خوا
وەرن قورئان تەماشاکەن سەرا سەر
بەووردی سەیری فەرمانی خواکەن
هەمووی ئازانج و کەلکە بۆ جەماوەر
ژیانی بەرزی پێغەمبەر بزانە
لەبەر جوانی رەوشتی بۆتە سەروەر
ئەڕێگەی دا بەکەس گەردن کەچی بێ
ئەچاوی بڕیە ماڵی لات وبێ دەر
لە ئایین تێ بگە یەکسانە ئینسان
عەرەب بێ یا عەجەم رەش یاخو ئەسمەر
ئەوەی کەلکی پتر بێ ئەو لەپێشە
لەکن ئایین لەلای یەزدانی ئەکبەر
لەدین گەر شارەزابی بێ گومانم
لەجێی شێخ ناسیا خواناس ئەبێ هەر

